هێمن حمه جزا

# هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پـــڕ ئەکا !

شیعر

سلێمانی _ ٢٠٠٦

هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !


- ناوی کتێب: هەمیشە ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !
- ناوی نوسەر: هێمن حەمە جزا
- بابەت: شیعر
- تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە
- ساڵی چاپ: چاپی یەکەم _ساڵی ٢٠٠٦
- دیزاینەر: ساسان عەزیز

## لەبری پێشەکی :

*( لەوێیە دورگەی گۆڕستان ، دورگەی خامۆشی ، لەوێیە ... گۆڕەکانی لاوێتیم ،دەمەوێ بۆ ئەوێندەرێ ... تـــاجەگوڵێکی هەمیشە ســـەوز بەرم ، کە ... ژیـــــانە !! )

*( ڕاکە ، هاوڕێم ، بۆ نێو تەنهاییەکەت ڕاکە ! تۆ ، لەبەر هات و هاواری گەورە پیاوان کەڕو ، لەبەر فێڵی بچوکەکان ... بریندار دەتبینـــــم !! )

فریدریک نیچە
(وەهای گوت زەردەشت)

هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !

## پێشکەشە بە :

* تۆ ... کە ئێوارەیەکیان بەدەم شیعرخوێنـدنەوەوە ، گریایت !
* ئەو ... کەناتوانێ بە تەنهایـــــم ڕابێت !

هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !

## پێڕست :

***ئەچمەوە بۆ ئەوێ ،***
***بۆ ماڵی مردن ...!***



**ئەگەڕێمەوە بۆ ئەوێ ...**
**هەرچەندە ئەزانم ،**
**ئەم خەیاڵە ... ئەمکوژێ !**
**ئەم بیرکردنەوەیە ... شێتم ئەکا !**
**ئاخر لەوێ ،**
**پڕبەسوزگییەك ... یادەوەریم جێهێشتووە !**
**پڕبەئینجانەیەك ... عەشقم کۆکردۆتەوە !**
**پڕبەمشتێك ... مەراقم چاوەڕێمە !**
**ئەچمەوە بۆ ئەوێ ،**
**بەقەد تەڕی نارنجێك ... بیری ئەوێ ئەکەم !**
**بەقەد مزری سێوێك ... داڵغەم لەوێیە !**
**من ... ئەبێ بچمەوە بۆ ئەوێ !!**
**دڵنیام ئێستا لەوێ ،**
**باخچەیەك ... خەونم پێوەئەبینێ‌و ڕائەچڵەکێ !**
**کۆڵانێك ... شەکەت شەکەت ،**

بەدواما ئەگەڕێو جگەرەئەکێشێ !
کۆترێك ... چاوەکانی هێند بۆم فڕیوە ،
لەحەژمەتا باڵەکانی لەفڕین ئەکەوێ !
ئێستا لــــەوێ ،
کچێك ... ئێوارەی بەسەردا دێو
گلەیی لەبەختی خۆی ئەکا !
مناڵێك ... دێتە حەوشەو
سەرەتاتکێ لەگەڵ چاوەڕوانی دایکیا ئەکا !
پیاوێك ... دەستی گرتوە بەنوری خوداوەو
لەدڵی خۆیا کوفر ئەکا !
من ... ئەبێ بچمەوە بۆ ئەوێ !!
لێـــــرە ،
کەزیاد لەگوناهێك و
کەزیاد لەدڵێك و
کەزیاد لەعەشقێك ... هەیە



بـــۆ تـــۆ !
تۆیەك ... کەهەمیشە ڕازیت بەخوسانەوە !
تۆیەك ... کەهەمیشە لەجەنگ ئەگەڕێیتەوە ،
دیلیـــــت !
ئاخر پێم وتی :
ژیان ... بەوهەموو گەورەییەی خۆیەوە ،
بەدیلی بەڕێناکرێ !
پێـــم وتیت :
شەو ... بەوهەموو تاریکییەوە ،
بەجەنگی تۆ ڕۆشن ناکرێ و
خودا ... بەوهەموو ئیمانەوە ،
بەبوغزی تۆ تورەنابێ !
بــــــیرمە ...
بەرلەوەی بگەڕێمەوە بۆئێرە ،
بـــۆ ژیـــان ..!

ژنێك ... كەماڵێكی لەبۆنی ڕیحانە چێكردبوو
ژنێك ... كەدەستەكانی بەبنمیچی بەهەشتەوە هەڵواسیبوو
ژنێك ... كەقسەكانی كتومت بەتەڕی باران ئەچوو
بەدڵی شكاوی مناڵییەوە پێیووتم :
دەخیلت بـــــــم ،
كەچـــــــوویتەوە ...
هێندەی مانەوەی پەڕەسێلكەیەك ،
لەسەر پەلكێك گیا
هێندەی بێزاری باخەوانێك ،
لەجریوە جریوی چۆلەكە
سەرێك بـــــدە ،
لەباخچەی گوڵەمیناكانم ... لەوێ !
سەرێك بـــــكە ،
بەماڵی پڕترسی مناڵیماو
كەمێك لەبۆنی ئەوبغوردەم بۆبێنەوە



كەدایكـــــــم ،
هەموو ئێوارانێك
بەرلەهاتنەوەی باوكم ... دایئەگیرسان !
پێیوتـــــــم ،
تكات لێئەكەم ...
هەرئەوەندەی گیرفانێك بیگرێ
گلەیی ئەوكوڕە تورەیەم بۆبهێنەوە ،
كەهەموو شەوێك دوای مەست بون
پڕبەكۆڵان هاواری ئەكرد :
چەند تەنگەبەرو
چەنـــــــد پیرو
چەند چارەڕەشە ... ئەم كۆڵانە ،
نازانـــــم ژیان ...،
چۆن ڕێی تێئەكەوێ !؟
پیاوێك ... كەهەموو داڵغەی ،

لای ڕادێوکـــــەیەو
لای کلاوەکـــــەیەو
لای ژیـــــــان بوو
بەو پەڕی ساویلکەییەوە پێیوتم :
کەچـــــوویتەوە ...
بـــــیرت نەچێ ،
کتێبی یادەوەری شۆڕشگێڕان و
شریتێك بەناوی ئۆپێرای جەنگەوەو
تابلۆیەك بەڕەنگێکی تۆخی زریکەم ... بۆ بهێنەوە !
کەچوویتــــــەوە ...
بـــــیرت نەچێ ،
شەرمی ئەوکۆترەم بۆبهێنەوە ... کەبەتەنها ئەفڕێ !
ترسی ئەوگوڵەم بۆبهێنەوە ... کەبەدزییەوە بۆنی دێ !
ڕقی ئەوبارانەم بۆبهێنەوە ... کەدرەنگانێکی شەو ،
بەخـــــوڕ ئەبارێ !



بیرت نەچـــــێ ،
تکایە هاوڕێ ... بیرت نەچێ !!
ئێستاکە تەواو درەنگەو
من ... ئەبێ بچمەوە بۆئەوێ !
ئـــــــای خودایە ...
چۆن لەبیرم چۆوە !
هێندە بەشپرزەیی هاتم
هەرنەمکـــــــرد ،
زەرفێك گوڵەبەڕۆژە و
گورزێك نقوڵی ترش و شیرین ...
یـــــــان هەرنەبێ ،
مەتارەیەك شەربەت و
زەمیلەیەك هەرمێ ...
لەگەڵ خۆما بهێنم ... !
وای خــــــودایە ...

چەند موسافیرێکی دەست بەتاڵ بوم !!
خۆمن باش ئەمزانی ،
ژیان ... هێند قسە ڕەق و توڕەیە
گەر خۆتی لێنەغلافێنی ،
هەربە پێوە کەرتت ئەکا !
وای ... ئەڵێی ئەوکاتەیە تەنهام !
ئەڵێی ئەوڕۆژەیە ،
کەکچێك بەدەم حەوشەشتنەوە پێیووتم :
مـــــن و خوشکەکەم ،
هەردووکمــــــان ...
بەقـــــەد ،
خواردنی چلورەیەك ... لەڕەنگی هەنار !
بەقـــــەد ،
لەبەرکردنی شیعرێك ... لەوپەڕی بێئیشیو
لەوپەڕی پەستیـــا !



بەقـــــەد ،
گوێگرتن لەگۆرانییەك ... لەڕقی باوکم !
خۆشـــــمان ئەوێ !!
وای خودایە ... وای !
من ... کەچوم بۆ ئەوێ ،
بۆ ماڵـــــی مردن ...
ئـــــەم کۆڵانە ،
پڕپڕبوو لەیادەوەری !
پڕپڕبوو لەژیـــــان !
سەرسوچی کۆڵانەکەمان ،
ماڵێکی گەورەبوو کەهەربەمزگەوت ئەچوو
تەواوی قورسایی ژیان و
تەواوی قەرەباڵغی کۆڵانەکەمانی لەسەربوو
ئـــــەوێ ...
لەشەودا تاریکترین ماڵی کۆڵانەکەمان و

ترسناکترین ماڵی گەردوون بوو !
جگە لەخــــــوداو
جگە لە مجەوەرێك ،
کەسیدی لێنەئەژیا !
کەمێك لەملاتــــــر ...
هەربەئەندازەی گوێلێبونی دوو پیرەمێرد ،
لەڕازەکانی یەکدی ...
باخچەیەکـــــــی لێبوو ،
کەجگە لەگوڵەمینا و
گوڵەیـــــــاسەمین و
دێراوێك کەرەوز نەبێ ...،
هیچیتری نەئەگرت !
باخەوانی ئەم باخچەیە
هێند تورەبـــــــوو ،
هەمیشە ... دوعای ،



لەخۆیـــــــــیو
لەکۆتــــــــرو
لەمناڵ ... ئەکرد !
حەمامێك لەکۆڵانەکەمانا بوو ،
هیچ یاسایەك نەیئەگرتەوە ... !
دایکم ... کەبانگی ئەکردمەوە بۆخۆشتن ،
پـــــــڕ بەگەرووم ...
پڕ بەکۆڵان ... ئەمقیژان و ئەمووت :
وای خودایــــــــە ،
چەند ڕقـــــــم ...
لەئـــــــاوو
لەخـــــــۆڵ و
لەدایکمـــــــە !
پیاوێك کەخاوەنی هیچ نەبوو ،
جگەلە ... ئەسپێك و

عەرەبـــــــانەیەك و
قامچییەك ... نەبـــێ !
بەردەوام پیاسەی بەکۆڵانا ئەکردو ئەیوت :
ژیـــــــان چیە ؟
جگە لەسەیرکردنی ژن و
گۆرانی وتـــــن و
پیاسەکردن نەبێ ... بەکۆڵانا !
ژنێك ... کەبوغز خەریك بوو ئە یخوارد لەماڵەوە
ژنێك ... کەهەمیشە عاجزبوو لەخۆیی و لەدراوسێ
ئێواران کەئەهاتە دەرێ
بۆلای عەرەبانەی میوەو سەوزەکە ،
بۆنی عەتـــــــرو
بۆنی خوێندنەوەو
بۆنی تەڕیـــــی ...
ڕقی دایکم و تەواوی ژنانی کۆڵانی هەڵدەسان !



کوڕو کچەکانی ئەم کۆڵانە
هێندەیان نامەو
هێندەیان گوڵ ،
بۆ یەکتر ناردبوو ...
پێیان وابـــوو:
ئیدی ژیان ... چیتر نییە ،
جگە لەشیعـــــــرو
لەباخچە نەبـــــێ !!
دوکانێك لەناوەڕاستی کۆڵانەکەمانا بوو ،
جێی هەموو شتێکی تیائەبوەوە ...
جێی هەتاوو کتێب و
جانتــــاو سەبیل و
ڕاستەو بغـــــورد و
جێی ملوانکەو سابوون و
پەیـــین و چۆلەکە و

نوقڵ و شقـــــارتە و
جێی جگەرەو مستیلە و
جـــێی هەرشتێك ...،
کەژیـــــان و
کـــــەدڵ و
کەخەڵکی کۆڵان ... بیخوازێ !
وای خــــــودایە ...
کۆڵانەکەی ئێمە ...،
هەرکەڕۆژی لێئەبووەوە
لەبەر میهـــــــرو
لەبەر ژیـــــان و
لەبەر جە نجاڵی ... ڕێنەبوو بڕۆی !
کۆڵانەکەی ئێمە ...،
کەئەکەوتە گومانەوە ،
گوڵی دەرئەکردو



لەو پەڕی بێزاریشیا ... بارانی لێئەباری !
کۆڵانەکەی ئێمە ...،
هەمــوو ئێوارەیەك ،
ســــــاتێك بۆئارامی
ســــــاتێك بۆخەیاڵ
پە پولە تێی ئەداو
شەو نمی لەخۆی ئەتەکاند !
کۆڵانەکەی ئێـــــــمە ،
هەموو شتێکی لەخۆڵ بوو !
پیاوێك ... کەبەردەوام بە ( بابەگەورە ) بانگمان ئەکرد !
پیاوێك ... کەیەکەمین کوڕی میهرەبانیو
کەیەکەمین کەسی ناو کۆڵانەکەمان بوو !
هەمیشە پێیوابـــــوو ...
ئێمە جگە لەجادەو ماڵەکا نمان ،
خۆشمان هەرسەر بەتایفەی خۆڵین !!

ئـــــــای ... خودایە ،
من ... کەسەر بەتایفەی خۆڵ و
کەسەر بەخێڵی کۆڵانی ژیان بم
ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ ،
بۆ ماڵـــــــی مردن !!
هەرچەندە ئەزانم ،
ئەم تەنهاییە ... ئەمکوژێ !
ئەم یادەوەرییە ... شێتم ئەکا !

مانگی ( ٣ – ٥ ) / ٢٠٠٤
سلێمانی

## تەنهایی و کوشتنێکی ،
## هەندەسەییـــانە !!



**هێشتاکە دوودڵم ،**
**ئەو ماڵەی لێوەی هاتم و**
**ئەو ماڵەی ئابڕوی عەشقم تیابرد ..**
**ماڵی هەنارە مێخۆشەکان بوو**
**یـــــان ..،**
**ماڵی سێوە مزرەکان ؟**
**نازانم ئەوماڵە ،**
**ماڵی ئەو قومرییانە بوو**
**کەئاه و نزولەی عەشق گرتبونی ..**
**یـــــان ..،**
**ماڵی پوشکە بەقنە بەغیلەکان ؟**
**تەنها ئەوەندە ئەزانم**
**ماڵێك بــــوو ،**
**پڕ لەسندوقی شەڕ و**
**ژوری یـــــاساغ و**

درەختی ئاشوبگێڕ ..!
ئـــای .. چەندە جێگەی گریان بوو
ئەو مـــــــاڵە ،
بێئەوەی ئیزنێك لەدەریا بخوازن و
بێئەوەی بەقەڵەم بۆیاخێك ،
ختورەکانی ئێوارە ڕەنگکەن ..
هەموو سەرەسەعاتێك ..،
دوای نەفەسێکی قوڵ لەجگەرەکانیان ،
پێیان ئەوتـــــــم :
ئەزیـــــــزم ..،
عەشق ئالودەبوونە بەو شتەمەحاڵانەی ،
کە هەرگیز... تۆ پێیان ناگەی !!
چەندە سەیر بوو !
مـــــــن ..،
نەکوڕی بومەلەرزە بووم ..



نەکوڕی تۆفان !
نەخەتای من بوو ،
ئاگر ئاوی توڕە ئەکرد و بورکان هەڵئەســــا ..
نەخەتای منیش بوو ،
خۆڵ ئەچووە چاوی ( بـــا ) وەو بەڕەشی هەڵیئەکرد !
خۆ گوناهی من نەبوو ،
کە نەمئەزانــــــــی ،
شەوان بەجل و بەرگی ماچەوە بخەوم و
بەیانیانیش بەتڕوتفاقی شەڕەوە بەخەبەر بێمەوە !
خودایە ... بمبەخشە !!
هەروەك چۆن لەقەلەباچکەیەك خۆش ئەبی ،
بەردەوام بەڕەشی بفڕێ !
هەروەك چۆن لەچڵەگیایەك خۆش ئەبی ،
هەمیشە لەدڵی خۆیا دوعا بکا !
هەروەك چۆن لەنەیزەکێك خۆش ئەبی ،

**هەموو شەوێ بەخاووخلیچکی مانگ پێبکەنێ !**
**بەو ئەندازەیە ... بمبەخشە !!**
**بەئەندازەی سیس بوونی گوڵێك لەباخچەیەکی غەمگینا ... لێم خۆشبە !**
**بەبارستایی فڕینی مێشولەیەك لەهەوایەکی نسرما ... لێم خۆشبە !**
**بەقەبارەی هەڵخزانی بەردێکی مناڵکار لەشاخێکی پیرەوە ... لێم خۆشبە !**
**ئەی ئەوەی بەردەوام ،**
**بەجرپنـــــی لیمۆ و**
**بەساویلکەی گێلاس و**
**بەدەستەمۆیی هەرمێ ... پێئەکەنی !**
**دڵنیــــــابە ،**
**هەرگیز تۆ ... بەدەم تریقانەوەی باخەوانەوە نامری و**
**هەرگیز تۆ ... لەسەوزایی باخچەیا حەقیقەت نابینی !**
**ئیدی بــــــڕۆ ... تۆ ،**
**نەخودا لێت خۆش ئەبێ و**
**نەباخچە لێت ڕازییەو**



**نەلەگەڵ خۆشتا ... ئاسودە ئەبی !!**
**من ئەمزانــــــــی ..**
**عەشق هێند ناسکە ،**
**دەستی لێبدەی هەڵئەوەرێ**
**وەلێ تۆ ... نەتئەزانی !**
**من ئەمزانــــــــی ..**
**پەیوەندی نێوان باخچەو مرۆڤ**
**هێند نـــــــزیکە ،**
**هەرکەسێ توڕەبێ هەردووکیان پێکەوە ئەمرن**
**وەلێ تۆ ... نەتئەزانی !**
**من ئەمزانــــــــی ..**
**لەســــەرو شاخەوە ،**
**ئیدی هەرچییەك هەبێ**
**حەلاڵی پەڕەسێلکەیە**
**وەلێ تۆ ... نەتئەزانی !**

ئەفســــــوس ..،
هەرگیز من واڕانەهاتبوم ،
لەکۆڵانێکی ناو گەردونا حەزبەمردن بکەم و
بەبەرچاوی کتێبەکانی پەروانەوە
قەشمەری بەفڕین بکەم !
فــــــڕینێك ..،
کە پڕبێ لەخەیاڵی گوڵ و
کە پڕبێ لەداڵغەی بیابان .. !
تازە بەمن چــــــی !!
کەتــــــــۆ ..
لەکۆڵانێکا بمری پڕبێ لەژیان و
عەشق لەواسواسی خۆیەوە ،
ڕەدوی یەقین بکەوێ و
خوداش لەکێڵگەیەکی پڕشکستا ،
شەتڵی جاویدانی بنێژێ !



بەمن چی .. ؟!
بەمـــــــــن چی ...
تازە تۆ ماڵێ لەگوڵ بچنی و
دڵی شکاوی باخچەیەکی وشك بوو
بەمژدانەی سەوز بوونەوە بهێنیتەوە !
تازەبە من و تۆ چی !!
ئاخر بیرت نەچێ ،
تــــــــازە ئێمە ...
دووقوتابـــــــی ڕاسبین ،
لەو وانانەی پەیوەندییان ... بەعەشق و سەفەرەوە هەیە !
ئەی بەبیرتــــــــا نایەت ،
ئەو مامۆستایەی بەردەوام بەشە پۆلی دەریاکان بێزار دەبوو !
کەلە پـــــــۆلا ..،
جیاوازی نێوان ماچی تەڕو وشکی لێئە پرسینەوە ..
من وتۆ ... چ شەرمێکی منالآنە دایئەگرتین ؟

یـــــــــان ..،
کاتێ مامۆستای جوگرافیا ،
کەدەیویست بەخەیاڵ سەفەری گەردونمان پێبکا ..
من وتۆ ... چ ترسێکی دوورکەوتنەوەمان لێئەنیشت ؟
ئـــای ...لەمن وتـــــــۆ ،
چ بوونەوەرێکی سەیر بوین ؟!!
بەردەوام لەوانەی ئاینا ،
دوعامان ئەکرد وئەمان وت :
خودایە ... تۆ عەشق نزیك کەرەوە ... عەشـــــق !!
یـــــــــان ..،
لەوانەی دارشتنا ،
هەمیشە ئەمان نووسی :
مـــاچ .. ڕەنگی شینە و
ئیدی هەموو ڕەنگەکانی دیش ... ڕەنگی کوفرن !
مامۆستاش بەردەوام لێمان توڕە ئەبو ئەیوت :



ئێوە ... دوو کافری ئەبەدین !!
تۆ بـــــــــڕوانە ..،
بەوهەموو ڕاڕاییەی خۆمانەوە ،
چەندە .. بەیەکتر ئاوسین و
چەندە .. بەیەکتریش نامۆین ؟!
ئیدی هیچ شتێك پێویست نییە ..
کاتژمێر ، چارەکی ئەوێ بۆمردن و
کەسمان جەسارەت ناکەین ،
بنوســـــــــین :
لێرەوە ... وانەی تەنهایی کۆتایی هات !!
ئیدی موسافیر هەبێ یا نەبێ ،
هیچ لە مەفهومی فڕین ناگۆڕێ !
تۆ .. تەماشاکە ... تەماشـــا ..
مەرگ چەنـــــــدە جوان ،
عەشقی زەرد هەڵگەڕاندووە !

ژیانی چەندە هەندەسەییانە ،
لەگەڵ دەنـــــکە هەڵوژە و
دەنکە ترێکانا ... تێك تر نجاندووە !
ماوەی نێوان خوداو مەرگ ،
تەنها دووماچە و ... هیچی تر !!
ئیدی پێم مەڵـــــــێ ..
چەند خولەکی تـــــــر ..،
لەناو تە پوتۆزی یەکترا ،
خۆمان ون ئەکەین ؟
یان پێم مەڵـــــــێ ..
ئەم جادەیە لەکوێندەرەوە ،
ئـــــــەبێتە دووڕا و
بەهەوەســـی کامان ،
ڤین لە ڕۆیشتن هەڵئەگرین ؟
تکایە .. هیچی ترم پێمەڵێ ..!



پێم مەڵـــــــێ ..
چەندجار بەسێوم وتووە ... هەی گەمژە !!
پێم مەڵـــــــێ ..
چەند شەو بە شەمشەمەکوێرەم وتووە ... هەی جەلاد !!
پێم مەڵـــــــێ ..
چەند ڕۆژ بەئاسودەیم وتووە ... هەی کاڵفام !!
من نامەوێ ئیدی پێم بڵێی :
تۆ سەیـــــــرکە ...
ئەڵێی ئێوارەین ... لەمیهرەبانیا !
ئەڵێی ماچین ... لەهەڵوەرینا !
ئەڵێی بارانین ... لەبەغیلیا !
ئەڵێی شەهیدین ... لەبێدەنگیا !
ئەڵێی پە پولەین ... لەتێفکرینا !
ئەڵێی شیعرین ... لەسەحەرا !
پێم مەڵـــــــێ :

ئـــــــــاخر ...،

من وتۆ ... قە تماغەی برینێکی بەهەشتین !

من وتۆ ... سەرەتای قەسیدەیەکی درێژین !

من وتۆ ... دوو قوتابی تۆبەکارین !

من وتۆ ... ماچێکی خوساوەی ژێر بارانین !

من وتۆ ... ئایەتێکی عەشقین !

من وتۆ ... جیهانێکی تەواو مزر و

تەواو حە پەســـــــــاوین !!

تـــــــــەواو ...،

ئیدی لێرەوە ،

بڕیارە ژیان تەواو بێ !!

هـــــاکا ...مەرگ هات !

هێنـــــدەی نەماوە ...،

ئیدی مە پرسە لەوەی ،

ئێمە بەم دەمامکانەوە بەنیازی کوێین ؟



تێبگە لــــــــەوەی ،

شەو نەخەوتن هیچ لەمەفهومی عەشق ناگۆڕێ ؟

خەفەت مەخۆ بەوەی ،

تەنها باخچەیەکت ماوە بگەیتەوە بەسەفەر ؟

کە مەرگ هــــــــات ...

من و تۆو پە نجەرەو تەنهایی‌و جادەو

فەلسەفەو عەشق وخوداو سەفەر وکۆڵان و

باران و شەو و دارشەق و باخچە و نیشتمان ...

هەرهەموومان پێکەوە ئەڕۆین !

هەرگیز دوودڵ مەبە لەوەی ...،

قسەیەك هەیە و نەتکردبێ !

گۆرانییەك هەیە و نەتوتبێ !

دەستێك هەیە و تەوقەیەکت لەگەڵا نەکردبێ !

گوڵێك هەیە و بۆنت نەکردبێ !

سوپاسێك هەیە و نەتکردبێ !

ڕێگایەك هەیە و نەتبڕییێ !
هیچ دوودڵ مەبــە !!
کاتێ کەمەرگ دێ ...
هـــەرهەمومان ،
هەرهەمومان وەك یەك ..
وەك چە پکێك ڕێواسی پیر ..
وەك بارانێك لەنیوە شەوا ..!
بەبـــــێ بۆن و
بەبێ قەناعەت و
بەبێ سلاو ... ئەڕۆین !
ئەو ســـــــایە ،
عەشق عەنتیکەترین وەهم و
سەفەریش دۆزەخیترین خەیاڵ ... ئەبێ !
خـــــــودایە ..،
تۆ .. مەرگمان بۆ عا شق کە .. مەرگ !!



خـــــــودایە ..،
تۆ چاوێکمان بەرێ ،
تاکوێربوونی پێحونجە کەین !
تۆ دەستێکمان بەرێ ،
تا سلاوێکی لە باخچە پێ بکەین !
تۆ دڵێکمان بەرێ ،
تا تیایدا عا شق بین !
نازانـــــــم ..،
خودا بەم هەموو گەورەییەی خۆیەوە ،
چۆن ئەبیەرژێ ..
مێرولەیەك بکوژێ ؟
یـــــــان ..،
بەو هەموو حیکمەتەی خۆیەوە ،
چـــۆن دەستی ئەگا ..
کەوانەیە بۆ کوفرەکانم و

نیشانەیە بۆ گومانەکانم و
گریمانەیە بۆ پەژموردەیم ... دانیٚ ؟
خـــــــــودایە ..،
گەر تۆ باخەوانی ئەم هەموو باخە سیٚوانەی ..؟
گەر تۆ پاسەوانی ئەم هەموو خەیالاٚنەی .. ؟
گەر تۆ حەکیمی ئەم هەموو برینانەی ..؟
دوو دڵیم یەکلاکەرەوە ... دوودڵیم !!
هیٚشتاکە دوودڵـــــــم ..،
ئەو ماڵەی لیٚوەی هاتم و
ئەو ماڵەی عەشقم تیا هەلاهەلا کرد ،
ماڵی پە پولە یاخییەکان بوو ؟
یـــــــــان ..،
ماڵی زیٚوانە کافرەکان ؟
خـــــــودایە ..،
لەم دەمەدەمی مەرگەیا ... فیٚرمکە ،



چۆن دەست بەنورتەوە ...بگرم ؟
چۆن بەدیار سیس بونی گوڵیٚکەوە ...دوعا بکەم ؟
چۆن بەداڵغەی بەهەشتەوە ...ئاو بدویٚنم ؟
چۆن قەناعەت بەڕیشۆڵەبکەم ...کە ئیماندارترین تەیرە ؟
چۆن بەلاولاو بڵیٚم ...تۆ لەڕەگەزی خودایت ؟
چۆن شەهیدیٚك تیٚبگەیەنم ...کەشەوانە لە پاڵ خۆتا ئە یخەویٚنی ؟
خـــــــــودایە ..،
لەم ئانوساتی مەرگەیا ...ڕامبیٚنە ،
بەکۆتر بڵیٚم ... تۆ تاکو بفڕیت لەگوناە پاك ئەبیتەوە !
بەدایکم بڵیٚم ... تۆ تاکو فیٚری سەما نەبیت ناچیتە حزوری خودا !
بە باخەوان بڵیٚم ... تۆ تاکو هەموو دنیا نەکەیتە شەتڵی لیمۆ ،
بەر ڕەحمەتی خودا ناکەویت !
بەمنالاٚن بڵیٚم ... ئیٚوە تاکو ڕابکەن لەخودا نزیکتر ئەبنەوە !
بەبیابان بڵیٚم ... تۆ تاکو گەردوون فیٚری لم پەرستی نەکەیت ،
پاڕانەوەکانت بەهەدەر ئەچیٚ !

**بەسەوزایی بڵێم ... تۆ تاکو تەڕتربیت پیرۆزتر ئەبی لەلای خودا !**

**خـــــــــودایە ...،**

**لەم چاوەڕوانی مەرگەیا ...تێمگەیەنە ،**

**چۆن چۆنی قۆخ بەو هەموو توکەوە ... ئەتوانێ بمرێ ؟**

**چۆن چۆنی چرا بەو هەموو نورەوە ...ئەتوانێ بمرێ ؟**

**چۆن چۆنی سنەوبەر بەو هەموو  سەوزییەوە ... ئەتوانێ بمرێ ؟**

**چۆن چۆنی شەو بەو هەموو ئەستێرەیەوە ... ئەتوانێ بمرێ ؟**

**چۆن چۆنی سەگ بەو هەموو وەفایەوە ... ئەتوانێ بمرێ ؟**

**چۆن چۆنی خاڵخاڵۆکە بەو هەموو ڕەنگەوە ...ئەتوانێ بمرێ ؟**

**ئێستاکە تێگەیشـــــــــتم ،**

**من وتۆ .. لەهەر جەمسەرێکی بیرکردنەوەو**

**لەهەر سوچێکی دوڕانابین ..  پێکەوە ئەمرین !**

**من وتۆ .. چەند بەیەکتر نامۆو**

**چەند لەگەڵ یەکترا تەنهابین .. هەر پێکەوە ئەمرین !**

**من و تۆ .. چەند ڕاسبین لەعەشق و سەفەرا و**



**چەند ناتەبا و گوناهباربین ..**

**دواجـــــــار ،**

**هەرپێکەوە ئەمرین !**

**تەواو ... ئیدی لێرەوە ژیان کۆتایی دێت ... تەواو !!**

**مەرگ هات ... م .. ە .. ر .. گ.. !!**

**مەرگ ... دارو پەردووی داین بەسەر یەکا !**

**مەرگ ... ئە نجن ئە نجنی کردین !**

**مەرگ ... ناو و ئەدرەسی هەمووانی گۆڕی !**

**لەنـــــــاو مەرگا ،**

**نە باران هەیە .. و**

**نە کۆڵان هەیە .. و**

**نە مـــــــاچ ..!**

**خـــــــودایە ...،**

**تۆ مەرگمان بۆ عا شق کە ... مەرگ !!**

**مەرگ ... هەمووانی کردە شارێکی بێشوناس !**

**مەرگ ... هەمووماني كردە تەیرێكی دەستەمۆ !**
**مەرگ ... هەمووماني لەیەك ڕەنگ هەڵكێشا !**
**مەرگ ... هەرهەمووماني برد و**
**تەنها چاوێكی نەهێشتەوە .. بۆ بینین !**
**تەنها دڵێكی نەهێشتەوە .. بۆ عەشق !**
**تەنها قاچێكی نەهێشتەوە .. بۆ سەفەر !**
**تەنها دەستێكی نەهێشتەوە .. بۆ سلاَو !**
**تەنها دەمێكی نەهێشتەوە .. بۆ دوعا !**
**تەنها گوێچكەیەكی نەهێشتەوە .. بۆ بیستن !**
**مەرگ كەسماني جێنەهێشت ... تەنها دودڵی نەبێ !**
**مەرگ كەسماني جێنەهێشت ... تەنها گومان نەبێ !**
**مەرگ كەسماني جێنەهێشت ... تەنها ڕاڕایی نەبێ !**
**عەســـــــرێك ..،**
**بەڕوت وقوتی مەرگ هات و**



**بەبێ جیاوازی ،**
**هەرهەمووماني لەماشێنێكی خۆڵەمێشی خزان و**
**لەكۆڵانێكی ئەودیو كۆڵانەكاني گەردوونەوە ،**
**پێی وتـــــــین :**
**كەهـــەر ئێستێ ..،**
**بەهەرچی داڵغە و**
**بەهەرچی عەشق و**
**بەهەرچی گوناه و**
**بەهەرچی پێكەنین و**
**بەهەرچی سەفەر و**
**بەهەرچی تێفكرینتانەوە هەیە ... ئەمرن !!**
**ئیدی تازە بەئێوە چی !!**
**بەئێوە چـــــی ؟!**
**عەشق هەبێ یـــا نەبێ ؟**
**سەفەر هەبێ یـــا نەبێ ؟**

خودا هەبێ یـــا نەبێ ؟
جادە هەبێ یـــا نەبێ ؟
بە ئێوە چـــــــی ؟!
باخچە هەبێ یـــا نەبێ ؟
پەنجەرە هەبێ یـــا نەبێ ؟
دارشەق هەبێ یـــا نەبێ ؟
فەلسەفە هەبێ یـــا نەبێ ؟
بە ئێوە چـــــــی ؟!
کۆڵان هەبێ یـــا نەبێ ؟
شەو هەبێ یـــا نەبێ ؟
باران هەبێ یـــا نەبێ ؟
نیشتمان هەبێ یـــا نەبێ ؟
تازە بە ئێوە چی !!
بە ئێوە چـــــــی ؟!
تەنهایی ... هەبێ یـــا نەبێ ؟!



بـــــــــرادەر ..،
ئیدی دوودڵی ناوێ !
ئەو ماڵەی لێوەی هاتووی و
ئەو ماڵەی شەرەفی عەشقت تیا بردووە ،
گرنگ نـــــــــییە ..،
ماڵی هەناره مێخۆشەکان بووە !
یـــــــــاخود ،
ماڵی سێوە مزرەکان ..!
گرنگ نـــــــــییە ..،
ماڵی پەپولە یاخییەکان بووە !
یـــــــــاخود ،
ماڵی زێوانە کافرەکان ..!
گـــــــــرنگ ..
ئەمە شەڕێکە و دۆڕاندووتە ..!
تۆ بڕوانە ... لەدۆڕاوی تۆوە ،

**عەشق مرد ، سەفەر مرد ، خودا مرد ، جا دە مرد ،**
**باخچە مرد ، فەلسەفە مرد ، کۆڵان مرد ، پەنجەرە مرد ،**
**شەو مرد ، دارشەق مرد ، باران مرد ، نیشتمان مرد ،**
**وەلێ بەر لە مەرگ هێندە بزانە ..**
**تەنهایــــــــــی ..،**
**هێندە شیعرییانە ،**
**گرەوی ... لەمن و .. لە تۆ و .. لە ژیان ..،**
**بـــــــــردۆتەوە ،**
**ئەوەتـــــــا ..**
**هەر هەموومانی پێکەوە**
**لە ماڵێکی پەڕپوتی ئەو پەڕی دوونیا کۆکردۆتەوەو**
**هەریەکەشـمان ... بەدزی ئەوی ترمانەوە ،**
**دەکـــــوژێـــت .. !!**

**مانگی (٦ بۆ ٨) / ٢٠٠٢ / سلێمانی**

## چ قیامەتێکە ... خاتونی من !

بۆ تۆ ... لەچاوەڕوانی هاتنتا هێندە پیربوم ، کەنامناسی !!



بەڕوخسەتی خۆت ،
وەك شتێك دەمەوێ ... بڕۆم !
دەستم گرتووە بەدڵمەوەو
تا ئەوسەری ڕێگاکە تەنهام !
ئەمشـــــــەویش ،
کەوەك هەمیشە دەزانم نایەیت ...
وەلـــــــێ ،
چاوەڕوانتم !
چ قیامەتێکە خاتونی من ... چ قیامەتێ !!
کەس ، لەفکری کەسدا نییە !
خودایەك ... کەلەم دەورو بەرەدا دەژی ،
گەرەکیەتی بڕوا !
هەنارێك ... کەبەدووی مانایەکی تردا دەگەڕێ ،
ئیدی ... بەتەڕی و
بەســـــــوری و

بەباخچە ... ڕازی نىیە !
ئـــــــەویش ،
لەکەڵکەڵەی ڕۆیشتنایە !
ڕۆیشـــــــتن ..،
وتنەوەی گۆرانییەکی منالآنەیە ...
لەدوای تێربونت لەماچی کچێك ،
کە ( هیچ ) لەبارەی ڕۆیشتنەوە نازانێ !
ژماردنی ماڵ بەماڵی کۆلآنێکە ...
لەژێر بارانێکی لێزمەیا ،
کەتـــــا ئەوکات ..،
کەس ( شتێك ) لەبارەی ڕۆیشتنەوە نا پرسێ !
وەك شتێ دەمەوێ ... بڕۆم !
خۆم و جانتایەکی سوور
وەك بۆیەی نینۆکەکانت ...
بێزارتر لەو ئێوارەیەی ،



کەوەك باران بەسەریەکا بارین و
پێت وتـــــــم :
ئەها بەم تەڕیەشەوە ،
هێشتا پڕیت ... لە یەئس !
ڕۆیشــــــــتن ..،
سەفەری من و تۆ بوو
بەبۆشـــــایدا !
ڕۆیشـــــــتن ..،
پیاسەی ئەو ڕێگایەیە
کەکۆتاییەکەی ..،
بە ئـــــاو دێت
یـــــــــان ...
بە ئاســـــمان ؟!
سبەینێ ... من لەوێم !
لەژێر ئەو درەختەی ،

کەئێوارەیەکیان پڕ بەدڵ
پێت وتـــــــم :
خۆشم ئەوێی !
سبەینێ ... من لەوێم !
بەخۆم و کیسێك خەنە و
جانتایەك هەتاوەوە ...
لەو جێگەیە چاوەڕێتم ،
کەبۆنی خەنجەر و
ئەســـــــپ و
باران ... لەجلەکانمەوە دەهات !
تـــــــۆش ...،
وەك ئەوەی دڵت ختورەی کردبێ
گۆرانیت بۆ ئەوتم و
وردە وردە جێت ئەهێشتم !
من لەوێـــــــم !



لەو باخچەیەی ،
کەتا بۆنی عەترمان لێوە دەهات
ماچی یەکترمان ئەکردو
لەپڕێکا پێت وتم :
ئەزانی چەند خۆشە ،
بەدەم داکرمانی نوقڵێکی ترش و
کەمێك پێکەنینەوە ...،
لەدڵەوە بەکەسێك بڵێی :
خۆشـــــم ئەوێی !
من لەوێـــــــم !
لەبەردەم ئەو ماڵەی ،
کەهەموو عەسرێك تیایدا منالْ دەبمەوە .
لەو حەوشەیە چاوەڕێتم ،
کەدایکم هەمیشە بەدەم شتنیەوە ...
دەمی دەجولاْنـــــدو

لەبەر خۆیەوە ... دوعای ئەخوێند !
لەوێـــــــم !
بەخۆم و جانتایەکی پڕ لەدوعاو سەلامەوە !
بەخۆم و کراسێکی تەنکی شینەوە !
بەخـــــۆم و دڵێکەوە ،
کە پـــــڕە لەیەئس و
کە پڕە لەخواحافیزی و
کە پـــــڕە لەختورە !
بەخۆم و پاکەتێك ڕەنگ و هەندێك گوڵەوە !
بەخۆم و سەعاتێکی میقاتکراوەوە بەڕۆیشتن !
بەخۆم و گیرفانێك پڕ لەڕەسمی نەدیتراوەوە !
من لەوێـــــــم !
ســــــبەینێش ،
کەوەك هەمیشە نایەیت ...
وەلــــــێ ،



چاوەڕوانتـــــــم !
چ قیامەتێکە خاتونی من ... چ قیامەتێ !!
تـــــۆ دێیت و
من تەنها بۆنم لەوێ ماوە !
تـــــۆ دێیت و
دڵم ، هێندەی هەنارێکی پیر ،
کەڵکی قسەی پێوەیە !
تـــــۆ دێیت و
وەك دەنکێك مورووی بزر ،
بەشوێنما دەگەڕێیت !
تـــــۆ دێیت و
تەنهایی وەك دارێك گێلاس ،
کرمۆڵـــــی کردووم !
تـــــۆ دێیت و
وەك باخێك هەرمێی گەیوو ،

**نـــــــامناسيتەوە !**

**وەك كتێبێكی شڕەڵە ،**

**دەستم تێوە نادەيت !**

**وەك كۆمەڵێك ڕەنگی ڕژاو !**

**كۆم ناكەيتەوە !**

**خاتونــــــــی من ..!**

**تۆ كاتێك دێيت ،**

**درەنگە بۆ ڕۆيشتن !**

**درەنگە بۆ عەشق !**

**درەنگە بۆ ڕوانين !**

**تــــــــۆ ...**

**درەنگ ... درەنگ ،**

**ئێوارەيەكی درەنگ دێيت و**

**دڵت هەزارو يەك ختورە دەكاو**

**لەبەر خــــــۆتەوە دەڵێی :**

**قسەيەكم ماوە ... بەر لەڕۆيشتن !!**

**مانگی ( ٢ – ٥ ) / ٢٠٠٥ / سلێمانی**

***شفاعەتەکانی من و لارا ...***
***لەحیکایەتەکانی تەریق بونەوەدا !***

به – توانا ئەمین – ی هاوڕێم پێشکەشە...کەزۆرترین بڕیاری ژیانی بەدەستە !



**ئە مجارەیـــــــــان ..**
**بەڕەوەیەك پیرە منالّی شفاعەتکارەوە دێمەوە !**
**دێمـــــــــــەوە و**
**ئەمەوێ بچمەوە ناوئەو ژورە ساردەی ،**
**کەسەفەر لەسەر پە نجەرەکەی بۆی نوسیبووم :**
**نابەلّەدترین موسافیر ... تۆیت !**
**دێمـــــــــــەوە و**
**ئەمەوێ بچەوە سەرئەو ڕێگایەی ،**
**کەبۆ یەکەمین جار چاوم لەسێبەرەکەی خۆم داگرت و**
**کچێك لەبەر خۆیەوە پێی وتم :**
**خۆپەرسترین عاشق ... تۆیت !**
**دێمـــــــــــەوەو ..،**
**نامەیەکی پەشیمانی بۆئەو گولاّنە ئەنوسم ،**
**کە پێـــــــم وتبون :**
**ئەوکچانەی بۆنتان پێوەئەکەن ... هەمویان سۆزانین !**

ئيمزايەكى خەجاڵەتى بۆئەو ئۆقيانوسانە ئەكەم ،
كەلەياداشتەكانيانا بۆم نوسيبوون ،
خودا بۆ پێكەنينى خۆى ... ئێوەى خوڵقاندووە !
باوەشێك بۆئەو سێوانە ئەكەمەوە ،
كە پێـــــم وتبون :
ئەو ڕەنگە سورانەتان ... نيشانەى تەريقبونەوەى باخەوانەكانتانە !
ئـــــاى ... لەمن ،
تەريقترين پياوى ناوگەردون !
بەسپێدەما ديـــارە ،
ئيفليجترين ڕەنگ و
گوناهبارترين كۆڵاَن و
حەرامترين كچم ... خۆشئەوێ !
ئـــــاى لەمن ... ئـــاى !!
ئەوەندە مرواريانە بير لەتەنهايى ئەكەمەوە ،
ئەڵێـــــم :



ڕەنـــــگە جەنگ ،
ستاتيكاترين قەرەباڵغى بێ !
يـــــان ئەڵێـــــم :
ڕەنگە فليقانەوەى هێشووە ترێيەك ،
سپيترين موناقەشەى من و خودا بێ !
دێمـــــــەوەو
تـــــا چاوبڕكا ،
شكستى ئاوتان بۆ ئەگێڕمەوە !
دێمـــــــەوەو
تـــا دەست بيگرێ ،
بێئەزموونى ( بـــا ) تان بۆ ئەهێنمەوە !
دێمـــــــەوەو
ئەو دوعايانە دێنمەوە بۆدايكم ،
كەلەكچێنييا بۆشوكردن كردبووى‌و
نەگەيشتبونە لاى خودا ...!

ئەو ماچانە دێنمەوە بۆیــار ،
کەشەو بەدزییەوەو لەدڵی خۆیا ناردبویو
عەشق هەستی پێنەکردبوو ...!
ئەو سێبەرانە دێنمەوە بۆئەو منالأنەی ،
کەنیوەڕوانان بە پێخاوسی دوای ئەکەوتن و
کەچی ... بۆتەنها جارێکیش ،
بۆیـــــــــان نەئەگیرا ...!
ئای لەمن ... چەندە بەتەریقی خۆم پەستم !
ئای لەوسەربازانەی ... چەندە بەکوشتنی خۆیان ناڕازین !
ئای لەودرەختانەی ... چەندە لەهەڵوەرینی گەڵاکانیان دوودڵن !
لارا ..،
تــا باڵای خۆر ،
( تەم ) داپپۆشیوم !
لەئێستاش بەدواوە ،
ڕۆیشتن بێسودە و



ئیدی ... هەرشتێکیش بکەین ،
لەکوفر ئەچێ ... لەکوفر !!
لارا ... کەها تمـــــــەوە ،
لەکۆڵانی دەفتەرێکتا هەڵمبگرە !
لەناوەڕاستی دێڕێکتا بمشارەوە !
وەکو نهێنییەکی زۆرقورس
لەماچێکا ،
ورد ورد بمگێـــــــڕەوە !
وەکو مەتەڵێکی نەزانراو
لە پیاسەی ئێوارەیەکتا ،
بمـــــــدرکێنە !
لارا ..،
من و تۆ لەخەیاڵی منالێکی وڕکن ئەچین ،
کەبەحەزێکی چڵکـــــــن و
هەوەسێکی قژدانەهاتووەوەو

ئارەزوویەکی بێمەنهەجەوە ،
لەماڵە کەڕولاڵەکەی دراوسێییان ،
قەرزی ژیان ئەکا !!
من دێمـــــــــەوەو
هەرچی میوەی عەسرانە ،
لەبەیانییەکا ئە یخۆین !
هەرچی تەریق بوونەوەمانە ،
لەژێر جلەکانی سەفەرەوە لەبەریان ئەکەین !
هەرچی مەرحەبایەك هەیە ،
لەدڵی خۆمانا ئەیکەین !
من دێمــــــەوەو
هەرچی نامەیەکمان بۆ هاتووە ،
بەماچ ئیملایان ئەکەین !
هەرچی ئەستێرەیەکمان گرتووە ،
لەداڵغەی سپێدەیەکا بەرەڵایان ئەکەین !



هەرچی تەنهایمان کۆکردۆتەوە ،
لە پاش پێکەنینمان بەڕێواس ... باسیان ئەکەین !
کچــــــێ لارا ...
کەهاتمــــــەوە ،
ژیان بەناوی مەرگەوەو
خۆشمان بەناوی خۆکوشتنەوە ،
یەکتری بانگەکەیــــــــن ...!!

مانگی (٢ بۆ ٤ ) / ٢٠٠٢ / سلێمانی

*" ژیان پڕە لەحیکایەت ..،*
*هەرکەس دێت و دەیەوێ حیکایەتی خۆی تەواو بکات ، لەسەر زەوی !*
*تائێرە ئاسایییە ..!!*
*بەڵام ئەوەی نائاسایی و ، یاخود قورس و گرانە ..،*
*ئەوەیە کەسێک بیەوێ حیکایەتی خودی خۆیو مرۆڤایەتی بگێڕێتەوەو ،*
*تاکۆتایش بیەوێ تەواوی بکا !*
*یان باشتر بڵێم ،*
*بیەوێ بەر لەمەرگ تەواوی حیکایەتەکانی مرۆڤ ،*
*تەواو بکات لەسەر زەمین ..!*
*ئاخر نابێ بیرمان بچێ ژیان بۆ ئەو یەکجارەو ،*
*مرۆڤیش تەنها یەکجار چانسی ئەوەی هەیە ،*
*حیکایەتی خۆی بگێڕێتەوە ..! "*

*  *  *

## ***میلۆدیای بەدحاڵیبوونی مرۆڤ ...***
## ***لەسەر زەمین !!***

**بۆ " لالۆ" ... کە دەمەوێت ئەم حیکایەتە تەواو بکات !**



**پێویستمان پێـــی بوو ..**
**بـــــەلاَم ،**
**تـــــازە ڕۆیشت !**
**ئیدی مەحـــاڵە ..،**
**ئەم بەدحاڵیبونەمان لەگەڵ ژیان ،**
**بۆ یەکلا بکرێتەوە !**
**چەند ناسینێکی ئاڵۆز بوو ، سەرەتا و**
**کۆتاییەکەشـــــی ،**
**چەند بەدحاڵیبونێکی بێمانا !؟**
**من ... هەمیشە ئاوها بوم !**
**هەمیشە پێموابـــووە ،**
**ژیان لەدەنکێك mورovی بزربووی شین دەچێ ..!**
**کەسمـــــــان ،**
**بۆمان نـــادۆزرێتەوە !؟**
**ئەوەی دۆزییەوە ... مرد !**

ئەوەی دەشی دۆزێتەوە ... دەمرێت !
پێویســـــــــتە ..،
قوڵتر بیربکەمەوە !
قوڵتر بەدویدا بگەڕێم و
قوڵـــــــتر تەماشای ،
ئەم میلۆدی بەدحاڵیبوونە بکەم !
دایکم پێی وابو ،
نوســـــــین ...
یەکەمین گوناهی مرۆڤەو
دواهەمین گوناهیشی ،
مۆســـــیقایە !
دایکم هەمیشە دەیگوت :
تۆ ... گوناهبارێکی ئەزەلیت !
ئـــــاخر تا تۆ ..،
لەسەر ئەم گوناهانەت بەردەوام بیت ،



کۆڵانەکەمان زیاتر ئاشوب ڕووی تێدەکا !
دایکم ... زۆرجار دەیگێڕێتەوە :
لەیەکەم شەوی دروست بوونمەوە ،
ئەم کـــــۆڵانە ..،
وەك ئەوەی گوناهێکی ئەبەدی کردبێ و
خەتایەکی گەورەی هەبووبێ ،
ئیـــــــدی ..،
ڕۆشنایی بۆ هەتاهەتایە لێی دورکەوتەوەو
بۆ تەنها جارێکیش ،
تیایدا هەڵنەهاتەوە !!
دایکم .. دەیگوت :
بـــــاوکت ..،
جمکانەیەك بو ،
لەجنسی خودا و
لەجنسی ڕوناکی !

عاریفێکی نەی ژەنی نێو ..،
ئەو بەشە زوڵمەتەی ژنان بوو ،
کـــــە ژن ..،
بۆ هەتـــایە ،
گیرۆدەیەتی !
هەمیشە باوکت ..،
لەتاریکیدا لێوەکانی ،
وەك دوو نەیزەکی پڕشنگدار ...
دەبریسکانـــــەوەو
خاڵی بەیەکگەیشتنی ،
نێوان ... گوناهی کۆڵان و
نوری خودا ... بو !
ئێستێ ئەدرەسی باوکت ..،
بەشێکی لەنێو خەیاڵی زەمیندایە ،
بۆ دڵدانــــــەوەی و



بەشەکەی تریشـــــی ،
لەناو خوێـــــن و
ترپەی دڵی هەر ژنێکدایە ،
کە تــــــۆ ..،
دەبیینی لەسەر زەمین !
دایکـــــم دەیگوت :
" کەئەمە نهێنییەو
تەواوی خەڵکیش دەیانزانی ،
کەهەگیز نهێنی نەبووە !؟ "
پێویستە مـــــن ..،
ئەم بەدحاڵیبوونە بۆ زەمین ،
یەکلا بکەمـــــەوە !
من ... کاتێك خەریك بووم ،
تە پوتۆزی شەڕی ئەو هەموو بەدحاڵیبوونەم
لەسەر مۆسیقاکان دەتەکاند و

دەمویست ... قوڵتر لەهەرجارێکیتر ،
بەناو نوسیندا شۆڕببمەوە ..،
دایکـــم لەحەوشەوە ،
دەستی بۆئاسمان بەرز دەکردەوەو
بەدڵێکی پڕەوە ... هاواری ئەکرد :
" ئـــــای خودایە ..،
ژیان چەند ناخۆشە بەوهەموو تاریکییەوە !
خـــــــودایە ،
گۆڕەکەشمان پڕکەیت لەنور ! "
ئاخر دایکم نایەوێ تێبگا
لەمیلۆدی ئەو بەدحاڵیبوونەی ،
کە ئەو توشی هاتووە ..،
لەگەڵ زەمـــین و
لەگەڵ ئاسمان !
دایکـــــــم ..،



بەردەوام لەگەڵ ژنانی کۆڵانی تاریکی ،
دە پـــــاڕانەوەو
دەگریــــــان و
دوعایان دەکرد !
پیاوانی کۆڵانیش ..،
وەك عادەتی هەمیشەییان ،
بەعەلاگە ڕۆشناییان ..
لەناو بازاڕ کۆدەکردەوەو
لەگەڵ دەستیانا دەیانهێنایەوە ،
بـــــۆ کۆڵان و
بۆ ماڵەکانیان !
کۆڵانەکەی ئێمە ..،
بێمەنهەجتریــــن و
سامناکترین ... کۆڵانی سەر زەمین بوو !
تەواوی منالأنی ئەم کۆڵانە ،

**خۆیان ناونابوو ... " ڕۆشنایی " !**
**ئــــــەم کۆڵانە ...،**
**پاشماوەی ئەو جەنگە درێژ خایەنانە بوو ،**
**کە مێژو وەڕس ببوو لەگێڕانەوەیان و**
**بۆ هەمیشە لەزاکیرەی خۆیدا ،**
**ســــــــڕیبویەوە !**
**کۆڵانەکەی ئێمە ...،**
**قومارچییەکی ساویلکە بوو ،**
**لەسەر حەقیقەت و**
**بـــــــەردەوام ...،**
**لەژێر باری گلەیی سروشتی خۆیدا ،**
**دەیـــــــنالاند !**
**ئەم کۆڵانـــــــە ...،**
**بەردەوام دەیگوت :**
**ڕەنگە خـــــــودا ...،**



**لەترسی تەنهایی خۆی ،**
**منـــــــی ...**
**لەم دیوە تاریکەی زەمیندا ،**
**هەڵگرتبـــێ !**
**یـــــان ڕەنگە ...،**
**ئەمە سروشتی ئەو تۆڵەیە بێت ،**
**کە مـــــــن ...،**
**لەبری گوناهەکانم ،**
**دەیدەمەوە بەزەمین !**
**کۆڵانەکەی ئێمە ...،**
**شەوانە لەژێر باری قورسایی ،**
**گوناهەکانـــــی و**
**تاریکاییەکەی و**
**ماڵەکانیـــــــا ...**
**وەک ژنێکی بوغزن ،**

تەماشایـــــی ..،
مانـــــگ و
بەفـــــر و
ئەستێرەکان ... دەکا !
وای خودایە ... وای !
چ کۆڵانێکی تامەزرۆ ، بەڕۆشنا یمان هەیە !
ئەم کـــــۆڵانە ..،
مێژویەکی درێژی هەبوو ،
لەســـــەر زەوی و
هەڵکەوتەی جوگرافیشی ..،
تەواو پێچەوانەی ،
کۆڵانەکانی دونیا بوو !
من کەلەمناڵیمەوە ،
موعتادم بەتەنهایی ..،
تــــــاکو ئێستا ،



بەقەد جانتاکەی شانم ،
تەنهایم پێ کۆکراوەتەوە !
هەمیشە لەگەڵ جانتاکەمدا ،
دەیدەم بەشـــــا نماو
ئێواران درەنگانێك ..،
درەنگتر لەهەر کاتێك ،
کەدایکم پێی دەوت :
" ناوەخـــــــت "
دەچـــــــومە دەرێ !
مـــــــن ..،
خاوتر لەهەرکەسێ ،
کەلەو کۆڵانەدا دەڕۆیشت .
دەگەیشتمە سەرسوچی کۆڵانەکەمان و
هەرجارێك بڕۆیشتمایە ،
بە پێچەوانەی جاری پێشووەوە دەڕۆیشتم و

هـــــەرکاتێکیش ..،
بەو کۆڵانەدا تێدەپەڕیم ،
دەستم دەکرت بەگریان و
لەکۆتایی کۆڵانەکەشدا ..،
چاوم دەخستە سەر ئەو نوسینەی ،
کەهێندە بەرز هەڵواسرابوو ..
کتومت دەتـــــــــگوت ،
بەدو ئەستێرەوە بەستراوە !
لەسەر سوچی خوارەوەی کۆڵانەکەماندا ،
کەلای چە پی ماڵی ئێمەی دەکرد ...
بەخەتێکی ناڕێك نوسرابوو ،
" نوســــــــین ..،
ئەو گونــــــاهەیە ،
کەهەرگیز کەسی لێ پاك نابێتەوە !
نوســــــــین ..،



گوناهێکە ، بێ کۆتـــــــا ! "
لەسوچی سەرەوەی کۆڵانەکەشماندا ،
کەدەکەوتە لای ڕاستی ماڵی ئێمەوە ...
بەبۆیاخێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی نوسرابوو ،
" مۆســـــــــــیقا ..،
ئـــــــەو دەنگەیە ،
کەهەرکەسێك بیژەنێ ..
سەر زەمینی لێدەبێتە ئاگر !
هەرکەســــــــێ ..،
ئالودەی بــــــێ ،
ژیانی لێدەبێتە دۆزەخ ! "
مـــــــن بەردەوام ..،
وەك ئەوەی لەگەڵ کەسێکدا قسە بکەم ،
کەبەژێر ئەو نوسراوانەدا دەڕۆیشتم ،
دەمگـــــــــوت :

پێویستە مـــــن ..،
ئەم بەدحاڵیبوونە لەگەڵ زەمیندا ،
یەکلا بکەمـــەوە !
سەیـــــــرە ..،
من ... بەبیرمدا نایەت ،
ڕۆژێ کەســــێك ،
لەکۆڵانی تاریکیدا ... مردبێت !؟
هەمیشە دەمگوت :
ڕەنگە ئەمانە هێشتا ..،
لەقورسایی هاوکێشەی ،
ژیان و مــــــردن ...
تێنەگەیشتبێتن ؟
ئەگەر نـــــا ..،
بۆ لەیادەوەری منا ...
کەسێك لەم کۆڵانەدا ،



نە لەدایك بووە و
نە مـــــــردووە ؟
دایکم دەیگـــــوت :
تۆ دواهەمین کەسی نێو کۆڵانی تاریکیت !
تـــــۆ بویت ..،
ئەم کۆڵانەت لێکردینە زیندان !
هەمیشەش لەیاسای ئێمەدا ..،
دواهەمــــــین کەس ،
ئاشوبــــــترین ..
کەسی نێو کۆڵانەکەمانەو
گوناهبارتــــــرین ..
کەسی سەر زەمـــین !
تـــــۆ پێویستە ..،
یـــــان ... بمریت ،
یـــــان ... خۆتبکوژیت !!

ئەگەر نـــــا ..،
ئەم کۆڵانە ،
لەم وەهمەی ئێمە پاك نابێتەوە !؟
ئیدی مــــــن ،
پێویست بــــــوو ..،
لەنێوان مردن و خۆکوشتنا ،
چارەنوسێك هەڵبژێرم !
ئەگەر نـــــا ..،
وەك دایکم دەیگوت :
" زەمین ... بۆ هەتاهەتایە ،
پشوی خۆی لەدەست ئەداو
باجی ئەو هیلاکییەش ،
دەبێت مرۆڤەکان بیدەن ! "
من ڕۆیشتـــــــم ..،
وەك ئەوەی کەدایکم ...



لەدواهەمین جاردا ،
بەر لەهاتنە دەرەوەم ،
پێیوتبــــــووم :
مــــــن ..،
یان دەبێت ... بمرم !
یان دەبێت ... خۆمبکوژم !
مــــــن دەڕۆیشتم و
هەستم دەکـــــرد ،
زەمـــــــین ..،
هەست بەقورسایی هەنگاوەکانم ناکا !!
بۆ ئەزمــــــون ..،
سروشتم بەردە باران کرد
پە نجەرەکانم بەڕوی بارانا داخست
شەقم لەناو قەدی شاخ هەڵئەدا
دەریام پڕ ئەکرد لەخۆڵ

گەلآی درەختەکانم دەوەراند
گوڵ و میوەکانم لێئەکردەوەو
بۆ دورترین شوێنی زەمین ،
فرێـــــم ئەدان !
هەر بۆ ئەزموون ..،
لەسەر ناسکترین شوێنی خاك ..
چیرۆکی فەوتانی زەمینم ،
دەگێڕایــــــــەوە !!
وای خــــــودایە ..،
" چ بەدبەختییەکە ... کاتێك هەست بکەی ،
ئاشوبترین کەسی سەر زەمین ،
تۆیــــــــت !
چ بێ ئومێدییەکە ... لەحزەیەك هەست بکەی ،
سەر زەمین پێویستی بەتۆ ،
نەمـــــــاوە !
چ پوچییەکە ... بۆ هەتایە هەست بکەی ،



ڕۆشنای سەر زەمین ،
تـــــــۆ کوشتوتە ! "
ئیدی بۆ ئەبەد بڕیارمدا بڕۆم و
بەدەم ڕۆیشتنیشەوە دەمگوت :
پێویستە بەر لەمردن ..،
وەهمی ئەم بەدحاڵیبوونە ،
لەگەڵ خۆمدا یەکلا بکەمەوە !؟
ڕەنگە ئەم شیعرە تەواو بێت و
هێشتاکە مـــــــــن ..،
لەوەهمی ئەم بەدحاڵیبوونە ،
ڕزگارم نەبووبێت ؟
ئەگەر نــــــــا ..،
دەگەڕامــــــــــەوەو
میلۆدی ئەم بەدحاڵیبوونەی مرۆڤم ..،
لەسەر زەمـــــــــین ،
ئاشکرا دەکــــــــــــرد !!

مانگی ( ١ و ٢ / ٢٠٠٦) / سلێمانی

## بـــــۆنێک لە تەڕیـــی و
## ڕەنگێـک لەتەنهایـــی...!



سور سور ئەچمەوە لەتەنهایی و
لەتەریقیشـــــــا ،
بەباخچە پێکەنینم دێ !
زۆر لەدوورەوە ئەبینم
کەدایکم .. ڕوتوقووت
هەروەك ئەوەیهیچ کەسێك نەیبینێ ،
بەیادەوەرییەکانی کچێنی خۆی ئەشوا !
دەستی لەنێو مەمکیدایە و
وەك ئەوەی بیـــــەوێ
هەوەسی دەریا هەڵسێنێ و
بەگیاش بڵــــــێ :
ئەمجارەشیان لەڕقی سەوزبونەوەی تۆ !
کچێك لەوخوارەوە ئەناسم
بەو هەموو بوغزەی خۆیەوە
هەمـــــوو ڕۆژێك ،

پاکەتێك سـا ویلکەی و
زەمیلەیەك ئەوین ...ئەفرۆشـێ !
کوڕێك لەتەنهاییا دراوسـێمە ..،
ئەوەندە شـێتانە عا شـقی مەرگە ،
هەموو شەوێك ...ڕۆمانێك لەسەرژیـان ئەخوێنێتەوە و
هەموو نیوەڕوانێك ...ئاوی گوڵەکان ئەدا و
هەموو ئێوارانێکیش ...هەروەك ئەوەی بیەوێ ( بـا ) توڕەکا ،
جگەرەئەکێشـێ و کوفرئەکا !!
سپی سپی ئەچمەوە لەتەنهایی و
لەکۆڵانێکا دائەنیشـــــم
سەرڕێژە لە دڵۆپە بارانی پەککەوتە و
لێوان لێوە لە پەپولەی بێئەزموون و
پڕپڕە لە درەختی گرینۆك !
ئیدی پێویسـتە لەمەولا ،
ئێـــــــــواران ..،



درەنگانێك بچمـــــەوەو
درەنگانێك دەست بکەمەوە بەخوێنننەوەی ،
شـکسـتەکانی کوکوختی !
من ...لەکۆڵانێکا نیشـتەجێم
دراوسـێیەکـــــــم هەیە ،
هەمیشە سەیری ئەتڵەسی عەشق ئەکا و
خەم دائەگـــــــرێ !
منالێك لەکۆڵانەکەمانایە
بەردەوام پێشـبینی ،
بۆ ... بارینی دوکەڵ و
ڕوخانــــــی شـۆڕش و
هەڵکردنی ( بـا ) ئەکا !
شین شین ئەچمەوە لەتەنهایی و
بە ڕەنگا وڕەنگی بەخۆم ئەڵێم :
ئەبـــــــێ باوەڕبێنم بەوەی

کەئیـــــــدی ،
پەڕەسێلکە ...هیچ مانایەك نادات بەفڕین و
باران ... هیچ ئارامییەك بەعەشق نابەخشێ !
باخچەیەك لەم نزیکانەدایە ،
شەوانە لەتوڕەییـــــــا ،
قومار لەسەر سەوزایی ئەکا و
بـــــەڕۆژیش ،
لەژێر قورسایی درەختەکانیا ئەناڵێنێ !
گوڵەکانی ئەم باخچەیە ،
شکستیان هێناوە لەبەردەم بۆنی جەنگاوەرەکانا .. !
میوەکانی ئەم باخچەیە ،
شکستیان هێناوە لەبەردەم غەمگینی پەپولەکانا .. !
باخەوانەکانی ئەم باخچەیە ،
شکستیان هێناوە لەبەردەم .. !
بۆنـــــــی خودا و



ژاوەژاوی مۆسیقا و
دەنگەدەنگی باران و ئاودا !
من ...ڕۆژانە لەکۆڵانێکەوە دێمەوە ناو ژیان
هەروەك بڵێی :
ئەو کۆڵانـــــــە ،
بێزاربێ ...لە تەنهایم !
عاجزبێ ...لە بێدەنگیم !
پێکەنینی بێ ...بەغەمگینیم !
من ...ڕۆژانە ئەدرەسی خۆمم لێوون ئەبێ !!
کچێك ئەیەوێ بمباتەوە بۆ ماڵەوەو ...ئەترسێ !
دارهەنارێك ئەیەوێ میوانداریم بکا و ...لە شەرما سور هەڵئەگەڕێ !
خەیاڵێك ئەیەوێ بمباتەوەو ...ئەمـــــــرێ !
پشیلەیەك ئەیەوێ خوڵقم بکا و ...لەتەریقییا چاوم لێناتروکێنێ !
شەهیدێك ئەیەوێ پێکەوەبین و...جەنگ ئەیدۆڕێنێ !
تەنهایی ئەیەوێ بۆ لای خۆیم بەرێ و ...لەنەگونجانی نێوان حەرفەکانیا ،

من .. لەبوونیخۆم ڕائەچڵەکێنیٚ !
تـــــــۆ... تەماشاکە ،
لەناو تەنهاییا چ دڵەڕاوکێیەك هەیە ..
( ت ) بەشەرعی داوای جیابونەوە لە ( ە ) ئەکا و
( ن ) هەمیشە موعتادەو خەیاڵ ئەییاتەوە ..!
( هـ ) بەژێر بارانا ئەڕوات و ئەگری ..!
( أ ) لەکەڵکەڵەی خۆکوشتنایە و
( ی ) ئەوەندە ڕەشبینە ، بەردەوام پێشبینی بۆمردنی خۆی ئەکا !!
سەوز سەوز ئەچمەوە لەتەنهایی و
لەماڵێکا ژیان ئەگوزەرێنم ،
سیخناخە لەبۆنی گەلاٚی زەرد ..
سیخناخە لەڕەنگی ڕاڕایی ئاو و
لەتامـــــــــی تەڕی ڕوخان ..
سیخناخە لەدەنگی مزری هەتاو !!
ماڵـــــــــی ئێمە ،



ئەکەوێتە سەروژاوەژاوی تەنهاییەوە و
کەمێك لەخوارووی دەستەواژەکانی تورەیدایە و
فاریزەیەك لەولا مردنەوەیە !
باوکم ... هێندە پەستە ،
لەڕەنگی کۆلاٚنەکەمان و
لەژمارەی ماڵەکەمان و
لەڕوتوقووتـــی دایکم ..
ڕۆژانە دڵی پڕئەبێ لە پێکەنین و
بەخەتێکی ناخۆش پێمان ئەڵێ :
بڕۆن ... جهەنەم جێگەتان بێ !
ماڵـــــــــی ئێمە ،
ئالودەبوون بەدەریا و
خەون بەسێبەرەوە ئەبینن و
سەرسامن بەلەت بونی مانگ !
ژنەکانـــی ئەم کۆلاٚنە ،

**هەروەك بڵـــــــێی :**
**ڤینیان لەخۆم و تەنهاییەكەم هەڵسابێ**
**بـــــــــــەردەوام ،**
**جنێوی خوساوەم بۆ وشك ئەكەنەوە و**
**دەموچاوی پێكەنیناوی عەسرانیانم لێئەدەن بەیەكا !**
**بەیانیـــــــــانیش ...**
**بەڤژی ئاڵۆسكاو و**
**جەستەی تەڕیانەوە**
**نەفـــــرەت ... لەمن و**
**لەبۆنی پیاوەكانیان و**
**لەڤروسكەی سەگەكانی كۆڵان ... ئەكەن !**
**من ... لەماڵێكا ئەژیــــــــم ،**
**هەموو ژوورەكانی بەتەنهایی ئاوسن و**
**هەموو دیوارەكانی ڕەنگی تەنهاییان گرتوە و**
**هەموو دەرگاكانی بۆنی تەنهاییان لێدێ و**



**هەرچی سەعات و .. ڕۆژژمێرو .. كتێبەكانیشی هەیە ،**
**تەنهاییــــــــان لێئەچۆڕێ و**
**تەنهایی ئەیانباتەوە !!**
**لەماڵـــــــــی ئێمەدا ،**
**هەمیشە گۆرانییەكت گوێ لێئەبێ**
**تەنهـــــــــا تەنها ...**
**وەك هەڵكردنی ( با ) یەك لەنیوە شەوا !**
**وەك لێكردنەوەی پرتەقاڵێك بەرلەوەی پێبگا !**
**وەك كوشتنی جەنەڕاڵێك لەكاتی مومارەسەیا !**
**لەماڵـــــــــی ئێمەدا ،**
**تەنهایی ...لەناو پیانۆیەكا جێئەمێنێ و**
**لەناو زەرفێكی نامەدا خۆی وون ئەكا !!**
**لەماڵـــــــــی ئێمەدا ،**
**تەنهایی .. فێری ورکت ئەكا ،**
**ورك لەهەرچی لێو و مەمكی كچانی دنیا هەیە ...بیگری !**

وڕك لەمردن ... بگری !
وڕك لەسەفەر ... بگری ،
سەفەرێك ... کەخۆشت نازانی بۆ کوێ ؟
تەڕ تەڕ ئەچمەوە لەتەنهایی و
لەشـــــــپرزەیما ،
جلەکانم دائەکەنم بۆ دەریا !
لەئـــاو ئە پاڕێمەوە ،
شەرحێکیترم بۆبکا ..
کەمەرگ ..کۆتایی بەکۆترەکان ناهێنێ ؟
کەگۆرانی وتن .. ئاسمان توڕە ناکا ؟
ئەچمەوە بەردەمی ئاوێنە و
هەروەك ئــــەوەی بمەوێ ،
کەس هەست بەشپرزەیم نەکا ..
دەنك دەنك هەنارێك هەڵئەوەرێنم !
هێشو هێشو دەست بەسەرترشی بۆڵێك بەرسیلەدا دێنم و



سێوێك هەربەتوێکڵەوە ،
لەت لەت ئەکەم !
بەو هەموو تەڕییەوە ...گومان ئەکەم ،
لەدۆستایەتی نێوان ڕیشۆڵە و بەفر !
لەعەشقی نێوان باران و پەلکەگیا !
لەتەبایی نێوان ئەستێرە و دەریا !
مــــــن ... دوودڵم ،
لەیادەوەرییەکانی دایکم ..
لەبیرەوەری باخچە ..
لەبێئەزموونی ( با ) ..!
دوودڵــــــم ..،
لەسەرگوزوشتەکانی سەفەر ..
لەنەزۆکی مانــــــگ ..
لەبێهوودەیی کونە پەپوو ..!
ئیدی پێویستە لەمەولا ،

بەرلە هەرەسی  سوپاکان
بەرلە ئاوەژوبونەوەی بەختی کچەکان و
بەرلە هاتنەوەی ئەوقوتابییانەی ...،
کەئێواران دەرگای قوتابخانەکانیان بەردەباران ئەکەن ،
بگەڕێمـــــــەوە !!
ئیدی ... پێویست ناکا ،
لەگەڕانەوەما بیرلە ئاو بکەمەوە ..
لە چ کاتێکا ئاوڕ ئەداتەوە و
لە چ شوێنێکا پرسیار ئەکا !
پێویست نــــاکا ،
بەماســـــــی بڵێم :
بەچ سیفەتێك دەریای خۆشئەوێ و
بەچ داڵغەیەکەوە شەوان ئەخەوێ !
پێویست نــــاکا ،
ئیـــــــدی ...،



هیچ شتێك پێویست ناکا ... هیچ !!
ڕەش ڕەش ئەچمەوە لەتەنهایی و
لە ڕاڕیـــــــــما ،
گاڵتەم بەئەوین دێ و
لە بەغیلیــــــما ،
هەنگ لەگوڵەکان دەرئەکەم و
لەبێهوودەیشــــما ،
قومارێ لەگەڵ مەرگا ئەکەم !!

مانگی ٢ / ٢٠٠٣ / سلێمانی

## هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !!



ئەی خەیاڵــــــــی من ،
توند توند باوەشم پیاکە و
بە ساکاریی دڵتەوە بم نوسـێنە !
بـــــا ئەمشەو ..
بۆ دواهەمین جار ..،
بۆ مـــــــردن ..
بۆ ڕوت بوونەوە ..
گوێ لە گۆرانییە پڕ حوزنەکەی تەنهایی بگرم !
هەمیشە ... ئەم گۆرانییە دڵم پڕ ئەکا !!
دڵـــــــــم پڕ ئەکا ..،
لە حیکایەتەکانی گومان !
لەڕەشی چڵێك ڕیحانە !
دڵـــــــم پڕ ئەکا ..،
لەدالغەی چۆلەکەیەك ،
کە کاتێ دێتە زەینییەوە ... چۆن ئەمرێ ؟!

دڵـــــــم پڕ ئەکا ..،
لەترشی بۆڵێك بەرسـیلە ،
کە چۆن خەون بەشیرینی ... هە نجیرێکەوە ئەبینێ ؟!
دڵـــــم پڕ ئەکا ..،
لە مزری دەنکێ هەڵوژە ..
لە سەوزی دەنکێك چوالە ..
کە چ موعاناتێکیان ،
لەگەڵ عەشق و گەورەبوونا هەیە !!
دڵــــم پڕ ئەکا ..،
لەعەشق و .. .. ڕوت بوونەوە !
لە گریان و .. .. مناڵ بوونەوە !
ئەم گۆرانییە ... هەمیشە دڵم پڕ ئەکا !!
دڵــــم پڕ ئەکا ..،
لە وەسوەسەی مــــــردن ..
لە حەرفەکانی خۆکوشتن ..!



دڵـــــم پڕ ئەکا ،
لە بێهوودەیی ئەو کوڕە موعتادەی ،
کە دواهەمین پێکی هەڵئەدا و
هێشـــــــتاکە ..
خەمە گەورەکەی بچوك نەبۆتەوە !
تەواو دڵـــــم پڕ ئەکا ..،
لە بۆنی تەڕبونی سنەوبەرێك لە عەشقا
لە بۆنی سور هەڵگەڕانی باخچەیەك لە شەرما
لە بۆنی هەڵوەرینی گوڵێك لەتەریقییا
لە بۆنی نەخواردنەوەی چـایەك لە بێزارییا
لە بۆنی وەڵام نەدانەوەی سڵاوێك لە غەمگینییا
لە بۆنی بارینی بارانێك لە بێهوودەییا
لە بۆنی قەرەباڵغی کۆڵانێك لە تاریکیـیا
لە بۆنی عەتری کچێك لە چوونیا بۆ عەشق
لە بۆنی دڵتەنگی قوتابییەك لە پۆلا
لە بۆنی لەتکردنی سێوێك لە عەسرا

لە بۆنی لێکردنەوەی لیمۆیەك لەزەردبونییا
لە بۆنی بغوردی ماڵێك لەترســـا
لە بۆنی گەیوی گێلاسێك لەتەنهاییا ..!!
تـــــــەواو تەواو ،
دڵـــــــم پڕ ئەکا ..،
لە بۆنی تەڕبوونی کۆترێك لە ژێربارانا
لە بۆنی مردنی موسافیرێك لەسەفەرا
لە بۆنی نوری ژنێك لەسەر بەرماڵا
لە بۆنی ئارەق کردنەوەی دوو پشیلە لەکاتی مومارەسەیا
لە بۆنی کوژانەوەی جگەرەیەك لەنیوەیا
لە بۆنی نیشـتنەوەی پە پولەیەك لە چواردەوری گڵۆپێکی ڕوناکا
لە بۆنی ویزە ویزی مێشولەیەك لە نیوە شەوا
لە بۆنی هەڵکردنی ( بـا ) یەك لە سپێدەیا
لە بۆنی خواحافیزی دوو برادەر لەئێوارەیا
لە بۆنی سەوزی دەسکێك کەرەوز لەو پەڕی تەڕییا



لە بۆنی فلیقانەوەی قۆخێك لە گەرمایا
لە بۆنی قاشێك شوتی لە نیوەڕۆیا
لە بۆنی داخستنی دەرگایەك لە توڕەییا ..!!
هەمـــــــوو جارێك ،
ئەم گۆرانییە ... دڵم پڕ ئەکا !!
دڵم پـــــــڕ ئەکا ..،
لە بۆنـــــــی ..
بغورد و پایز و عەشقی ... ئەو !
دڵم پـــــــڕ ئەکا ..،
لە ڕەنگـــــی ..
سێو و بەهار و گریانی ... ئەو !
دڵم پـــــڕ ئەکا ..،
لە دەنگـــــی ..
گوڵاو و باران و سەفەری ... ئەو !
ئەم گۆرانییـــــــــە ،

هەموو جارێك ... دڵم پڕ ئەكا !!
دڵم پـــــــڕ ئەكا ..،
لە گرتنی ڕەسمێك ...كەبۆ هیچم ناویٚ !
لە ڕەنگكردنی دیوارێك ... كە كەس بەلایا تیٚنا پەڕیٚ !
لە خواردنی پرتەقاڵێك ... كە هەرگیز بۆم ناخوریٚ !
دڵم پـــــــڕ ئەكا ..،
لە زەمیلەیەك هەنار و
لە هێشویەك تریٚ و
لە باخێك هەرمیٚ ..!
دڵم پـــــــڕ ئەكا ..،
لە هێلانەیەكی پڕ .. لە زەرنە قووتە و
لە ئاسمانێكی ساماڵ .. لە كۆتر و
لە بەفرێكی سپی سپی .. لە ڕیشۆڵە !
دڵم بەم گۆرانییە پڕ بووە ..!!
دڵم پـــــــڕ بووە ..،



لە شیعــــــــر و
لە نوێــــــــژ و
لە نـــــــــور ..!
دڵـــــــم پڕ بووە ..،
لە هــــــــاوار و
لە بـێئومێدی و
لە ڕوخــــــان ..!
ئەم گۆرانییـــــــــە ،
بە مەرگ و تەنهایی ... دڵی پڕ كردووم !!
مەرگ لەم گۆرانییـــــــــــەدا ،
ڕۆیشتنی شەمەنەفەرێكە بە ژێر هەورا
شكانی شوشەیەكە كە پڕە لەعەتر
سەیر كردنی ئاوێنەیە لە باخچەیا
ڕاكردنی مناڵێكە بەجوتێك پێڵاوی سورەوە
سڵاوی كوڕێكە لەقوتا بخانەیەكی كچان

تەریق بوونەوەی ژنێکە لەماڵەکەی دراوسێیان
قەرزی کافرێکە لەلای خودا
هاتنەوەی باوک و دایکێکە بەشەڕەوە
شتنەوەی پرتەقاڵێکە دووای لێکردنەوەی
ئیمزای دادوەرێکە بۆ کوشتنی باخەوانێك
ڕاونانی پەپولەیەکە لەشەوا
پێکەنینی مامۆستایەکە بە پۆلێکی تێکەڵاو لەکوڕ وکچ
بەندکردنی کەنارییەکە لەزەرفێکی نامەیا
گریانی سەربازێکە لەجەنگا
هەڵهاتنی هەنگێکە لە گوڵە یاسەمینێکەوە بۆ گوڵێکی دی ..!!
بـــــێئەنــــــدازە ،
ئەم گۆرانییە ... دڵم پڕ ئەکا !!
دڵم پـــــــڕ ئەکا ..،
لە ئاوابـــــــوون و
لە شکســــــــت و



لە بـــــــــاران ..!
بە ئەندازەیەك دڵم پڕ ئەبێ ..،
وەك ،
ڕاچڵەکانی چڵێك گیا ... لەکاتی تێڕامانا !
وەك ،
کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەیەك ... لەوپەڕی ئارامیا !
وەك ،
شڵەقانی گۆمێکی مەنگ ... لە قوڵایی خەیاڵا !
ئەم گۆرانییـــــــــە ،
بێئەندازە ... دڵم پڕ ئەکا !!
دڵم پـــــــڕ ئەکا ..،
وەك ,
تێر خواردنەوەی کوکوختییەك ... لەئاوی حەوشەی ماڵێ !
وەك ،
حەوانەوەی خاڵخاڵۆکەیەك ... لەسەر چڵێك گوڵ"!

وەك ،
فڕینەوەی پەڕەسێلکەیەك ... لەدوای پێکران !
دڵم پـــــــڕ ئەکا ..،
بێئەندازە دڵم پڕ ئەکا ...لەگریان !!
مـــــــن ..،
بێئەندازە دڵم بەم گۆرانییە پڕ بووە ..!
دڵم پـــــــڕ بووە ،
لە مـــــــۆسیقا و
لە دوعـــــــا و
لە بەخشـــــــین ..!
دڵم پڕ بـــــــووە ،
لە میهـــــــر و
لە دوورکەوتنەوە و
لە کـــــــوژران ..!
ئەم گۆرانییـــــــە ،



بەتەنهایی و مەرگ ... دڵی پڕ کردووم !!
تەنهایی لەم گۆرانییـــــــەدا ،
پڕکردنی زەمیلەیەکە لە هەتاو و هەرمێ
نیشانە گرتنەوەی ڕاوچییەکە لە مانگ
خواردنەوەی کوپێك قاوەیە لە نیوە شەوا
نوسینەوەی دێڕێك شیعرە لەسەر دەرگای حەوشە
پاککردنەوەی ماڵێکە لەمێروولە
خوێندنی دوعایەکە بەر لەخەوتن
داگیرسانی مۆمێکە هەر بۆ خۆشی
بەسەر بردنی شەوێکە لە قەراغ دەریا
داکرماندنی نوقڵێکە هەر بەکاغەزەکەیەوە
دۆزینەوەی دەنکێك مووروی شینە لە جۆگەلەیەك ئاوا
سەیرکردنی ماسییە لە حەوزێکی شوشەیا
کەوتنە خوارەوەی پەرداخێك شەربەتە لەسەر تە پڵەکێکەوە
ئاودانی باخچەیەکە لە ئێوارەیەکی درەنگا

**خواردنی قاپێك گوڵەبەڕۆژەیە هەربەتەنیا**
**نوسینەوەی وەزیفەیەکە لە دەفتەرێکی شەست لا پەڕەییا ..!!**
**ئەم گۆرانییــــــــــە ..،**
**هەمیشە و وەك جاران ..**
**بێئەندازە ... دڵی پڕ کردووم ،**
**لەمـــــــــردن و**
**لەتەنهایـــی و**
**لەگریـــــــان !!**

**مانگی ٧ / ٢٠٠٣ / سلێمانی**

## تەنهایی . . . پڕپڕە لە ئیعترافـــات !



**چەند ئیعترافێکی منالآنە بوو ،**
**کە بەڕەنگی پرتەقاڵەکانم وت :**
**ئێوە هەرگیـــــــز ،**
**ڕەنگتان لەڕەنگی عەشق ناچێ !**
**من ئەو دەمـــــەی ،**
**تازە بارانم ناسیبوو ..**
**بەشپرزەیـــــــی ،**
**بەڕوی دەریاکانا قیژاندم و وتم :**
**سـەیـــــــرکەن ..،**
**ئەو جەنگاوەرانە چەندە زیرەکن ،**
**لەوەڵاّم دانەوەی پرسیارەکانی شکستا !**
**ئەو میللەتانە چەندە بەدەست وبردن ،**
**لەگێڕانەوەی حیکایەتەکانی دۆڕانا !**
**ئەو ئیماندارە مەستانە چەندە هەڵەشەن ،**
**لەنوسینەوەی کتێبەکانی شەرەفا !**

ئۆهـ ... تەنهایـــــــی !!
دڵپیستر لەوەفـــا ..
عینادتر لەچاوەڕوانی ..
چاوچنۆکتر لە شادمانی !
مــــــــن ..
کاتێك لەنێو ڕستەکانی بێهوودەییا پیاسەم ئەکرد ،
فڕێت دامە سەری دێڕێکی فریوو خواردوەوە و
پێت وتــــــم :
لێـــــــــرەوە ،
دەستی فاریزەکانی بەردەم خۆکوشتن بگرە ..
ئەتباتەوە سەرکۆلآنەکانی مردن !
لێـــــــرەوە ،
بچۆرەوە پێش نیشانە سەرسوڕماوەکانی بەردەم ژیان ..
ئەگەیتەوە بەمـــــردن !
لێـــــــرەوە ،



دوراو دوور ..
دیقەت لەنیشانەی پرسیاری بەردەم هەموو ( بۆ ) یەك بدە ،
ئەچیتەوە لای مـــــــردن !
لەبیرم چوو ( .. .. .. .. ) !
تەڕتەڕت کەم بەمـــاچ
تا .. خۆرەتـــــــاوی فیراق ،
فریای وشك بونەوەت نەکەوێ !
لەبـــــــیرم چوو ...
بەخەیاڵی ئەستێرەکان بڵێم :
هەرگیـــــــز ،
لەگەڵ هەورا دەست تێکەڵ نەکەن ..
ئەو هەورانـــــەی ،
کەبەردەوام دوعای گەلآکان پوچەڵ ئەکەنەوە .. !
کەبەردەوام قۆپی لەبەفرئەکەن و
کەبەردەوام حەز بەحەیاچونی باخچە ئەکەن !

**من ... کەلەخەوی نێوان بیابان و لــما**

**بەخەبەر هاتمـــــــەوە ،**

**بەلێوی زەریاوە ... گۆرانیم بۆ گەورەبوونم ئەوت !**

**بەدەستی ئاوەوە ... چە پڵەم بۆکۆنشەرتۆکانی غەدر لێئەدا !**

**بەعەقڵی ئۆقیانوسەوە ... بیرم لەفڕین ئەکردەوە !**

**فریانەکەوتــــــم ..،**

**بەشەرمنیـــــــم بڵێم :**

**تۆ .. خودات خۆشئەوێت ،**

**ی ... أ... ن ... ؟**

**لەڕووم نەهـــــــات ..،**

**بەجورئەتــــــم بڵێم :**

**ئەرێ تۆ ... لەخودا ئەترسیت ،**

**ی ... أ ... ن ... ؟**

**دڵم نەهـــــــات ..،**

**بەباوەڕم بڵێـــــم :**



**ئەی تۆ ... خودا بە پیرۆز ئەزانیت ،**

**ی ... أ ... ن ... ؟**

**تۆ بـــــــزانە ..بزانە ،**

**چ ... ئیعترافێکت بەمن کرد !!**

**ئیعـــــــترافێك ..،**

**قائیمتر لەو ئیعترافانەی ...کەباران پێی کردم !**

**سەختتر لەو ئیعترافانەی ...کەلەبەردەم عەشقا کردم !**

**قورستر لەو ئیعترافانەی ...کەگومانەکانم پێیان کردم !**

**ئەی خۆشەویســـــت ..**

**تۆ تەماشـــــــاکە ،**

**هەمیشە پیاوێك هەیە ،**

**خەتی لە خەتی ئەو بارانە نەشارەزایانە ئەچێ ..،**

**کەبەشپرزەیی ئەبارێن !**

**ڕەنگی لە ڕەنگی ئەو لا پەڕە بێئومێدانە ئەچێ ..،**

**کەلەسنوری دەفتەری عەشقا ئەفسەرن !**

تۆ تەماشـــــــاکە ،
هەمیشە پیاوێك هەیە ،
بەدەم بیرکردنەوەو گۆرانی وتنەوە ئەمرێ !
بەدزی تەنهاییەوە خەیاڵ لێئەداو
بەدیار گریمانەکانیەوە ئیعتراف ئەکا !
ئەی خۆشەویســـــــت ،
بۆ نامناسییـــــــەوە ؟
ئەی تۆنەبویت کەلەماڵی قومرییەکانەوە ،
بەقەد بچکۆلانەی خۆت دەتقیژان و ئەتوت :
سـەیـــــــــرکە ..،
چەند پۆشتەو پەرداخە ... عەشق ؟!
ئـــای .. لەتـــۆ !
هەر تۆبـــــویت ..،
وانەیەکت لەبارەی هارو هاجی سەفەرەوە ،
بەکچە چاو باشقاڵەکان وتەوە و



بەمنیـــــش دەوت :
ئـــای ...چەند بێمانایە تەنهایی !!
ئۆهـ ... تەنهایـــــــی !!
ئاشوبـــــــتر لەخەیاڵ ..
شەڕەنگێزتـــــر لەبێهودەیی ..
زۆرزانــــتر لەسەراب ..!
مـــــن ئێستا ،
تەواو تەواو بەدگومانـــــــم ،
لەوماچانەی داومیتێ ... بەشێك نەبووبێ لەفەلسەفە !
لەوڕێگایانەی بۆم بڕیوی ... نەختێك نەبووبێ لەسیاسەت !
لەوسوێنانەی بۆم خاردوی ... کەمێك نەبووبێ لەفیتنەی !
لەوشەوانەی خۆمم بۆ گێڕاویتەوە ... تۆزێك نەبووبێ لەئیعتراف !
ئـــاخ .. بەیانی نایـــــەت ،
تـــا ...ئەم گەردونە جێبێڵم !!
ژیــــــــان هەرئەڵێی ..

بۆ ئیعترافەکانی من دروست بووە !
سوێنئـــــەخۆم ..،
بەنەفامیی خودا
بەگەورەیی تەنهایی
بەمیهرەبانیی یار
بەڕاڕایی ( بـــا )
بەڕەنگـــــی ئاو
بە پاکیزەیی مەرگ !
سوێنئـــــەخۆم ..،
بەشپرزەیی باران
بەدڵپیسیی گوڵ
بەوەفای گیـــا
بەعینادیی بەرد
بەئاشوبیی سەفەر
بەچاوچنۆکیی ماچ !



سوێنئـــــەخۆم ..،
بەتەڕیـــــی هەنار
بەڕەشبینیـــی بەفر
بەساویلکەیی سەحرا
بەجاویدانیی خاڵخاڵۆکە
بەمزریـــــی سێو
بەنهێنیی ئەستێرە !
نامەوێ تیشکی هەتاو ببینم و
بەڕوتوقووتی ئەم گەردوونە جێبهێڵم !
ئیـــــــدی ..،
سڵاوەکانم بەقەرز ئەدەمەوە بەدایکم ..
عەشق بەقەدکراوی ئەنێرمەوە بۆیار ..
پێکەنینەکانم بەزەرەر ئەفرۆشمەوە بەهاوڕێکانم ..
نیشتمان بەدیاری ئەنێرم بۆ تەیرە ڕەزیل و چروکەکان ..
شەو وەکو دڵدانەوەیەك ئەبەخشم بەدرەختە دودڵەکانی قەراغ شـــار ..

**لەحزەکانم تەسلیم بەهەورە بێتەجروبەکان ئەکەم ..!**
**گەر بەیانـــــــی بێت ،**
**پرس بەقەناعەتەکانی مناڵیم ناکەم و**
**بێئاگاداری ترس ئەڕۆم !**
**بەدزی فەسڵەکـــــــان و**
**بەدزی باخچەکـــــــان و**
**بەدزی تەنهایـــــــی و**
**بەدزی خـــــــۆم و**
**بەدزی بێدەنگـــــــی و**
**بەدزی سەعاتەکانەوە ... جێتان دێڵم و**
**ئـــــــەڕۆم ..!**
**ئـــــای ...چ ئیعترافێکە !**
**تـــۆ بزانە .. بـــــــزانە ،**
**چ ... ئیعترافێك بەمن ئەکەی !!**
**تەواو تەواو نزیکە لەو ئیعترافانەی ،**



**کەبەمناڵانی گەڕەك ئەڵێی :**
**تاکو ئێستا بەدارلاسیکەکانتان ،**
**چەند ئەستێرەتان خستۆتە خوارەوەو**
**چەندجار شوشەی پەنجەرەی ماڵی مانگتان شکاندووە ؟**
**یـــــــان ...،**
**بەکچە سۆزانییەکانی کۆڵان ئەڵێی :**
**شەوی چەند شەممان لەکن خۆتانەوە ئەنوون ؟**
**یـــــــان ...،**
**بەکوڕە هەرزەکارەکانی دراوسێ ئەڵێی :**
**لێوی کام مەحبوبەیەتـــــان ،**
**لەگشت لێوەکانیتر بەتامترە ؟**
**چ ئیعترافێك بوو ...تۆ بەمنت کرد !!**
**ئۆهـ ... تەنهایـــــــی !!**
**فیتنەتـــر لەدوودڵـــــــی ..**
**داگیرکەرتر لە پەشیمانی ..**

دووروتر لەژیـــــــان ..!
لێـــــــم گەڕێ ،
لێم گەڕێ ... تەنهایی ،
پێش پێی تـــــــۆ ..،
ڕەنگە دزێوەکانی ڕاڕایی و
دەنگە نەشازەکانی بێزاری ،
لەناو خۆیانا نغرۆیان کردم !
بەرلە هـــــــا تنت ..،
هێمای ڕوبارەکانی بەهەشت و
نیشانەی ئاگرەکانی دۆزەخ ،
هەرا ســــــانیان کردم !
هێنـــدەی نەبردووە ..،
حەرفە شەلەکانی شۆڕش و
ژمارە شومەکانی جەنگ ،
داگیریـــــــان کردم !



ئەوەندە نابـــــێ ..،
کیمیای خۆکوشـــــتن و
فیزیـــــــای سەفەر ،
لەخانەوادەکانیانا دەریان کردم !
هەر ئێستا بـــــوو ..،
مێژوی عەشـــــق و
جوگرافیای مەرگ ،
پێشێلیان کـــردم !
چرکە ســــــاتێکە ..،
مەملەکەتی ژیـــــان و
پایتەختی خۆشبەختی ،
لەئەرشیف کردنا لەبیریان کردم !
لێـــــــم گەڕێ ..،
با بەدیار پێکێکی ژەنگ گرتوو بەبێدەنگییەوە ..
مەست بـــــــم !

**با بەدەم حونجەکردنی ئیعترافەکانمەوە ..**
**بمـــــــــرم !**
**تەنهایی گیان ... لێم گەڕێ !!**
**با لە پەشیمانی فنجانێکەوە ،**
**دانت بەڕابردوما بۆ بنێم !**
**با لەخۆرئاوا بوونێکەوە ،**
**سەری وولاّتی ئایندەمت بۆ سپیکەم !**
**با لە خۆرهەلاّتێکیشەوە ،**
**چارەنوسمت بۆبسڕمەوە !**
**ئۆهـ ... تەنهایـــــــی !!**
**تۆ بزانە ... بـــــــــزانە ،**
**چ ... ئیعترافێك بەمن ئەکەی !**
**ئـــای .. تەنهایـــــــی !!**
**تۆ بزانە ...بـــــــزانە ،**
**چ ... ئیعترافێکت بەمن کــــــــرد !!**

**کۆتایی / ٢٠٠٢ – سەرەتای/ ٢٠٠٣/ سلێمانی**

***(مننننننن+ ئەوووووو ) = ( د ا ب ە ش ب و ن )..!***

**پێشکەشە بەئەو ...کەناوەختێک بەجێیهێشتم و**

**منیش ، هەرگیز کە لێی خۆشنابم ...!!**



**دڵم ، بەم دابەشبوونە خۆشە !**
**دڵم ، بەم لەدایکبوونە تەنگە !**
**پیـــــــاوێك ،**
**کە بەردەوام پرسیاری لەسپێتی ئەم ماڵەئەکرد ..؟**
**هەمیشە مـــــــن و**
**هەمیشەش ئـــــەو ... تورە ئەبووین !**
**قەدەرم ... ئەم گوناهانە بژەنە !!**
**قـــــــــەدەرم ...،**
**بەدڵی ئەوکچە سوێند بخۆ ،**
**کەبەبۆنی مێخەك و ڕیحانە موعتادە !**
**سوێنـــــــد بخۆ ...**
**کەلەیەکەمین ئێوارەی بارانا ،**
**شعورم پڕئەکەیتەوە ... لەیادەوەرییەکانی ئەو !**
**من و ئـــــــەو ،**
**پێکەوە لەدایك بوین !**

پێکـــــــەوە ،

لەباخێك گێلاسا ... لەو پەڕی دونیا !

پێکـــــــەوە ،

هەروەك ئەوەی بڵێی :

ئێمـــــــــە ...

سەر بەتوخمی ( نور ) بین

یـــــــان ،

سەر بەڕەگەزی ( با ) !

لەدایك بوونی من و ئەو

تەواو بـــــەئەندازەی ،

تێربونی چۆلەکەیەکە ... لەفڕین !

بێتاقەتی هەنارێکە ... لەتەڕی !

پڕبونی ئاسمانە ... لەشەو !

من و ئـــــــەو ...

هەرهێنـــــــدەی ،



دوودڵۆپ ئاو ... لەتەنهایـــــــــی و

هێنـــــــدەی ،

کوژانەوەی جگەرەیەك ... لەخۆکوشتن

گەورەتـــــرین !!

ئـــــــەو ...

کاتێك گۆرانی ئەوت ،

مێرولە تــــــــێئەداو

کاتێك حیکایەتی ئەگێڕایەوە ،

بارانی لێئەبـــــاری !

ئەو ... بەیادەوەریـــــا ،

دەیسەلماند کەلەمن پیرترەو

منیش ... بەتەماشاکردنا ،

دەمزانی کەلەو گەورەترم !

قەدەرم ... ئەم گوناهانە بژەنە !!

تەماشاکە قەدەرم ... تەماشـــــــا

ئەو ... چەندە بچووکە
بۆ ناسینەوەی حەقیقەت ،
لەئاوێنەیا !
ئەو ... چەندە منداڵە ،
لەگوزەرکردنا و
چەندە ساویلکەیە ،
لەعەشقا !
قەدەرم تەماشاکە ... تەماشا
چۆن من و ئەویان ،
بەسەر بچوك بوونەوەی گەردوونا دابەشکرد ؟
من و ئەویان ،
چۆن بەسەر دووجەمسەر و
بەسەر بیرچوونەوەیا دابەشکرد ؟
دڵم ، بەم دابەشبوونە خۆشە !
دڵم ، بەم دوورکەوتنەوەیە تەنگە !



ئەو ... کاتێك دابەشبووین ،
ئەیوت :
ئەبێ ببووری لەخۆت !
ببووری لەوەی ،
کەنیوەت لەخۆرئاوادایەو
نیوەکەی تریشت ،
لەخۆرهەڵات !
ئەمێستاکە ،
ئەو ... لەوێیەو
من ... لێرە !
ئەو لەوێیە ،
لەباخچەی پیاوە کۆمۆنیستەکان !
لە پارکی ئەو کچانەی ،
هێندەی بۆنکردنی گوڵێك
هێندەی وەڵامدانەوەی سڵاوێك

ئیمانیان بەفێمینستی دایکیان نەماوە !
ئەو لـــــــەوێ ،
دژ بەیاسای گوڵ و
لەڕقی میهرەبانی گیا ،
پە نجەرەکان لەکردنەوە بێبەش ئەکا !
وتـــــــار ،
لەسەر ڕووناکی مانگ و
لەسەر چوونە قەراغ دەریا ... ئەنووسێ !
ئەو ... پـــــــێیوایە ،
ئەبێ ڕیشۆڵە بێبەری بکرێ ،
لەهەموو ئەو ڕەنگانەی بەسەر شانەکانییەوەیە !
ئەبێ سروشت باجی سەوزایی لێوەربگیرێتەوەو
هەتـــــــاویش ،
گوناهبار بکرێ بەڕەنگ !
قەدەرم ... ئەم گوناهانە بژەنە !!



بیـــــــژەنە ..،
بیژەنە ... ئەم تاری مەراقە !
بیژەنە ... شمشاڵی ئەم هەموو دابەشبوونە !
ئەم سۆڵۆی تەنهاییە ... بژەنە !
ئـــــــەو ..،
کەدابەشبووین ئەیوت :
عاشقانە ، دەست لەژیان و
عاشقانە ، دەست لەم ئازارانە ... هەڵگرە !
من ... ئەمـــــــوت :
قەینـــــــا ،
بەم تەنهاییەی خۆم ڕادێم !
ئـــــــەو ..،
بەرلەدابەشبوون ئەیوت :
هەرچی سێوی دنیا هەیە ،
بەتـــــــریفە ئەیشۆم !

**هەرچی حیکایەتێك لەسەر دۆڕان هەیە ،**
**بــــــــەدرۆ**
**ئەیگێڕمەوە !**
**من ... ئەموت :**
**دڵم ، بەم هاوسەنگ نەبوونەمان ... تەنگە !**
**ئەو ... منـــــــاڵێك بوو ،**
**بەبوغزێکی گەورەوە دەژیا !**
**هەمیشە کەبەناو گوڵەکانا ئەڕۆیشتین ،**
**هیچی لەهەتاوەکە بۆ نەئەگێڕانەوەو**
**لقێ پێکەنینـــــــــی ،**
**لەلا جێنەئەهێشـــتن ...**
**هەروەك ئەوەی بیەوێ بڵێ :**
**ســـــــوپاس !!**
**تا ئەوبەری ئاوەکە ڕۆیشتین و**
**دەستێکی بەئاوەکەدا نەکرد ،**



**هەروەك ئەوەی بیەوێ بڵێ :**
**ماڵئـــــــاوا !!**
**تنۆك تنۆك خۆمم دایە و**
**بۆ دوا ئێـــــوارە ،**
**ویستـــم لەودا بمرم ..!**
**وەك ...،**
**کچێکی عەیـــــــار**
**وەك ...،**
**مەعشوقێکی میهرەبـــان**
**وەك هەرشتـــــــــێ ،**
**کەناتوانم ... بیڵێم !!**
**نەیـــوت :**
**بەدوعـــــا .. !!**
**قەدەرم ...ئەم گوناهانەی بـــــژەنە !!**

**مانگی ( ٧ – ٩ ) / ٢٠٠٤– – سلێمانی**

## بەڕوخسەت ... ڕەسمێک دەگرم !!



**ڕەنگە لەیادەوەریتا ... نەمابێ !**
**ڕەنگە قەت ... بیرت نەکەوێتەوە !**

*( ئەمە قسەی ئەو هاوڕێ گومانکارەمە کەپێکەوە لەژورێکدا دەژیاین و ...*
*کاتێک من بۆ نوسینی ئەم دەقە بۆ ماوەیەک بەجێم هێشت ،*
*وەلێ ئەفسوس لەگەڕانەوەمدا ، نەمدییەوە !!*
*ئەوەی پاش خۆی بۆی جێهشتبووم ،*
*تەنها ئەم دێڕە شیعرەو چەند دڵۆپێک خوێنە ...*
*کە بەئاوێنەی ژورەکەمدا هەڵپژا بوو ..،*
*لەوە دەچوو ............. !؟ )*

**ڕۆژێـــــــک دێت ،**
**بەجوتێك دارشەقی منالآنەوە**
**بەلاتا تێئە پەڕم و**
**نـــــامناسیتەوە !**

ڕۆژێـــــــــك دێت ،
بەدەم تواننەوەی کڵۆیەك شەکرەوە
کوێر ئەبـــــــم و
بیرت ناکەومەوە !
ڕۆژێـــــك دێت ،
لەمبەری بەیانییەوە
بۆ ئەوبەری ئێوارە ..،
کتێبێکت لەمێــژوو
بۆ دەخوێنـــــمەوە و
دیوانێکت لەخورافە
پێئەزبەر ئەکەم و
بەیتێکت لەوەفـــا
بەسەردا ئەخوێنم ...
ئەفســـــــووس ،
نایەمەوە زەینت !



ئیدی تێدەگەم ..،
" کەژیـــــــان ...
چ وڕێنەیەکی منالآنەیەو
لەدڵیشـــــەوە ،
کەسێك ... ئاشنا بەدەنگی
وەلێ زۆر درەنـــــگ ،
پێم دەڵــــــێ :
وێڵـــــــیکە ،
ژیـــــــان ..،
سۆفییەکە ... پڕ لەخەتا !
زێوانێکە ... پڕ لەتاوان !
وێڵـــــیکە ،
ژیان ... هیچ نییە ... هیچ !
جگە لەگوناهێکـــــی گەورە
ژیان ... هیچ نییە ... هیچ !! "

بەڕوخسەت ... ڕەسمێکم بگرە!
ڕەسمێـــــك ..،
کەچۆن بەباوەشێك ڕیحانەوە
خۆم دەکەمەوە بەماڵی خوداداو
هێشتاکە ... تەڕم ،
بەبۆنی کوفـــــــرو
بەبۆنی نـــــــزا !
لەسەر سنگی سەوزایی ڕائەکشێم و
ڕەسمێکم بگـــــرە ...!
کەچۆن لەدڵەوە پێکەنینم دێ ،
بەئاسوودەیــــــــی ...
ئەو کچەی کەدڵی خۆشە ،
بەنیشتنەوەی پەپولە لەسەر دەستەکانی و
پڕ بەماڵ دەقیژێنـــێ :
" ئەهـــــــا ... دایکە ،



هێشتاکە چەند پاکیـــــزەو
هێشتاکە چەند میهرەبانم ! "
ڕەسمێکم بگـــــــــرە ...!
کاتێـــــــــك ،
لەوپەڕی توڕەیدام
لەنامەی ئەو کوڕەی ،
کە بۆ کچێکی نوسیوە :
" ئەزیـــــــــزم ...
تۆ بۆنی خودا لەهەناسەکانتەوە دێ و
دڵـــــــــــت ،
وەختە بڵێـــــــــــم :
شتێکە لەچەشنی نور !
ئاخر هێشتاکە تۆ ..،
پڕیت لەعەشـــق و
پڕیت لەمیهــــــــر !! "

بەڕوخسەت ... ڕەسمێکم بگرە !

ڕەسمێـــــك ...،

کەچۆن بەوهەموو بێئۆقرەییەمەوە ...

دەمـــــــەوێ ،

پێکەنین ... بدەمەوە بەدەریـــــا و

بەلیمۆیەك ... دۆزەخ و بەهەشت ، ئاشت کەمەوە !

بەغروورەوە بەکچێك بڵێــــــــم :

تەنهایی ... هێندە سانا نییە .. !

کەوەك ئەوەی دڵت دەیخوازێ ،

ئێوارەیـــــــەك ...،

دور دور بیبەیت و

لەلۆچی کۆڵانێکا ... وێڵی کەی !!

تەنهایـــــــــی ...،

شتێکە لە پەلکی گیا ...!

هەمیشە لەبارانــــــدا ،



پەستییەك دایدەگرێ و

ڕێ هەڵە ئەکــــــا !

لەگەڵ فڕینـــــــدا ،

سەر بەیەك ڕەگەزن و

لەتوخمی ( سێبەر )ن ..!

تەنهایـــــــــی ...،

شتێکە بچوك بچوك ...!

هێندەی دەنکێك زەنبییانە ،

لەناو سەبەتەیەك موورودا ...

هێندەی بیرکردنەوەی پاسارییەك ،

لەسەفەری ئێوارەیەکی درەنگ ...

هێندەی گەینـــــــی سێوێك ،

لەسەر عەرەبانەیەکی پڕپڕ ... لە میوە !

تەنهایـــــــــی ...،

شتێکە لەئاوازێکی غەمگین ...!

کاتێك بەرێگادا دەڕوات ،
جێپێیکانی پڕئەبن لەئاو و
لەگەڵ نیشتنەوەیـــــــدا ،
ڕەنگی لێئەبـــاری و
کاتێکیش ... سەما ئەکا ،
پڕدەستمان ئەکـــــــا ...
لە عــــەتر !
لەوکاتەدا ... ڕەسمــــــم بگرە !
کەسیخناخم لەبۆنی ساردی ،
ژیـــــــان و
شپـــــــــرزەم ...،
بەجوابدانەوەی ئەو هەموو سڵاوە !
بەڕوخسەت ... ڕەسمێکم بگـــرە !
ئەودەمەی خەیاڵم سپی سپی دەچێتەوە و
بەدووی خۆمـــــــــدا وێڵم !



بەسەر ڕەشترین شوێنی ئەم بیرکردنەوەیەدا ڕائەکەم و
ڕەسمێکـــــــــم بگرە !
کەچۆن لەدڵەوە گاڵتەم دێ ،
بەقسەی ئەو مامۆستایەی ..،
کەهەمیشە پێیدەوتین :
" پێویستە ئێـــــــوە ...
هەر ڕۆژەی لە پۆلێك و
لەجێگەیەکی جیاوازدا ... دابنیشن ..!
ئەگەر نــــــــا ،
من دڵنیام ڕۆژێك ...
یادەوەری ئەتانکوژێ !
ئەو نیشتیمانەی کەبۆ هەمیشە ،
هاوتەرییە لەگەڵ شکستا ...
پڕتان ئەکــــــا ،
لەهســـتریـــــــا ..!

**عەشـــــــق ،**
**کەلەیاساکانی مندا ..**
**بـــــەردەوام ،**
**یەکسان دەبێتەوە بە " سفر "**
**وردو خاشتان ئەکا ..!**
**تکایـــــــــــه ،**
**بەر لەدەستپێکردنەوەی ئەم جەنگە ...**
**بۆ جارێکیتــــــــر ،**
**زاکیرەتـان پڕکەنەوە ... لە ئاو و**
**جێگۆڕکێیەك بەم کورسیانەتان بکەن !! "**
**بەڕوخسەت ... ڕەسمێکم بگرە !**
**ڕەسمێکـــــــم بگرە ..،**
**ئەو دەمەی لەگەڵ بەربوونەوەی هێشویەك ترێدا ،**
**دڵم دائەخورپـــــێو**
**نزیك ئەبمەوە ... لە مـــــــردن !**



**ئەو دەمەی سەرێك دەکەمەوە بەمالاَو ...**
**دایکـــــــــم دەبینم ،**
**لەگەڵ ... خۆیـــــی و**
**دوعاکانـــــــــــی و**
**کۆترەکانیا ... بەشەڕ هاتووەو**
**خەریکە نزیك ئەبێتەوە ... لە مردن !**
**ڕەسمێکــــــــــــم بگرە ..،**
**ئەوکاتەی دڵی گەیوی باخەوانێك ئەدەمەوە ،**
**بەزەمیلەیەك هەنـــــار و**
**مشتــــــــــێ جگەرە و**
**پڕگیرفانێك بـــــــاران !**
**ئەوکاتەی قەترە قەترە دڵی خوساوی ،**
**ئەو ژنە گیتارژەنە کۆدەکەمەوە ..،**
**کە سکیپڕە بەهەتـــاو و**
**ئێواران وەك شتـــــــێ ،**

**پەستی دایـــــدەگرێ !**
**ڕەسمێکـــــــم بگرە ...،**
**ئەو لەحزەیـــــــەی ،**
**لێوم بە پەرداخێك ... گۆرانی تەڕ ئەبێ !**
**ئەو لەحزەیـــــــەی ،**
**جوانی لەسەر دەستەکا نمەو**
**دەنك دەنك ... ڕوناکی ئەدەمێ !**
**ئەو لەحزەیـــــــەی ،**
**نامەیەکم پێدەگـــــاو**
**بەکردنەوەی ... بارانم لێ ئەبارێ !**
**بەڕوخسەت ... ڕەسمێکم بگرە !**
**ڕەسمێکـــــــم بگرە ...،**
**کاتێـــــــــك ،**
**لە پـــــــڕێکاو ...**
**بە پـــــــرتاو ،**



**خۆم دەکەمەوە بەژوراو**
**لەئـــــــــاوێنەکەوە ،**
**کەسێـــــــــك ...**
**وەك شتێ کەهەرگیز نەمدییێو**
**تەواو نابەڵەد بە خۆم ..!**
**پێم دەڵـــــــێ :**
**" وای ... چەند درەنگ هاتیتەوە ..!**
**هێندە پیربـــــــووی ،**
**دەڵێی تەواوی ژیانت دیوە ..! "**
**تۆ ... سەیـــــــرکە !**

***(ئەفسوس کاتێک گەڕامەوە ... هاوڕێکەم تەواو بێزاریو چاوەڕوانی ،***
***تەنگی پێهەڵچنی بوو ... تادواجار ( ............ ) !!***
***بەڵام بەر لەخۆکوشتنەکەی ،***
***ئەم دێرەی لەسوچێکی ئاوێنەکە بەقەڵەمێکی سور بۆنوسیبوم ... ! )***

**ڕەنگە لەیادەوەریتا ... نەمابـــــــیٚ !**
**ڕەنگە قەت ... بـــــیرت نەکەویٚتەوە !**

*" هاوڕێم ... ڕۆژگارێکی زۆرو زەوەند چاوەڕێم کردیت ..،*
*هەمیشەو وەک عادەتی ، خۆم بەگۆرانی وتن و هەندێک جار بەخوێندنەوەوە*
*خەریک دەکردو*
*لەدڵیشەوە دەموت : ئێستا نا تۆزێکیتر ... هەردێتەوە ...، بەڵام بەداخەوە !!*
*شەوگارێکی زۆریش بەدەم جگەرەکێشانەوە نەخەوتوم و هەرچاوەڕێت بووم !*
*بۆیە بڕیارمدا تاتۆ دەگەڕێیتەوە سەیری ئاوێنە نەکەم ،*
*تاکو بەشێواوی و پیربوونما ،*
*بڕوابکەی چەندێک چاوەڕوانی هاتنەوەت بووم ...،*
*بەهەرحاڵ من ڕۆیشتم ... خواحافیز.. !! "*
.................................................................
..................................................
......................................................

**بەڕوخسەت ... ڕەسمێکـــــــــــم بگرە !**
**ڕەنگە منیش ، ...................... !!**

**مانگی ( ٦ بۆ ٩ / ٢٠٠٥ )**
**سلێمانی**

## نامەیەک بەخەتی باران . . . بۆ تەنهایی !!



ئیدیتێگەیشتم لەوەی ،
کەدواجـــــــار ..
ئەم هەموو قەرزەی تەنهایی ،
بەم ئێوارە درەنگ وەختە نادرێتەوە !
واچـــــــاکە ..،
بەرلەگەڕانەوەم ،
سەرێك بدەم لەماڵی ئەو ئاسکانەی ..
کەبەردەوام بەدوای نەژادییانا ڕائەکەن !
واچـــــــاکە ..،
بەرلەچوونەوەم ،
بەدیار عاجزبوونی ئەو ڕەنگە ساردوسڕانەوە ..
سـەرخەوێك بشکێنم !
ئەو ڕەنگانـــــــەی ،
کە هەرگیز خودا هیدایەتیان نادا ...
نەبـــــــمرن و

نەبـــــــــڕژێن !!
تێگەیشـتم لەوەی ،
کە دواجــــــار ..
من بەبەرچاوی سلاَوێکەوە ئەمرم
کەدەبوو لەسێبەرێکا بمکردبایە ،
لەو ( بـا ) یانەی کە هەلاهەلان بەدەست قەدەریانەوەو
نەمکـــــــرد ..!
خودایە ... تۆ لەم گومڕاییەم خۆشبـە !!
دڵنیـــــــــام ،
ڕۆژێك هەرلەخۆڕاو... بەبێهەوەس ،
ئەگەڕێمەوە ماڵەوە و بەدایکم ئەڵێم :
پە نجەرەکانی ئەم ماڵە ،
هیچی ناڕوانێتە سـەر ژیان !!
ئیتر من و تــــــۆ ..
چۆن لەحیکمەتی فڕین تێئەگەین ؟



یـــــــان ...،
بەچ دڵێکەوە ،
چە پڵە بۆ عەشق لێ بدەین و
چــــــۆن ...،
ئافەرینی سـەما بکەین ؟
دایــــــکە ..
گەربەیانییەك ،
دەستەکانت لێت بێزابوون و
حەوسەڵەی پاڕانەوەیان نەما
ئەوە دەستەکانی باوکمە ،
بەبنمیچی ژورەکەوە ..
لەبری تۆ ... دوعا ،
بـــــــۆپە نجەرەو
بـــــــۆمردن و
بۆتەنهایی ... هەردووکتان ئەکا !

جەخار .. لەگەڕانەوەما ،
مەرگ هێند شپرزەی کردبووم ،
ماچێکی خۆمم نەکرد ... لەئاوێنەکەیا !
دەستێکم بەسەری عەشقا نەهێنا ... لەدڵی خۆما !
دوعا خوازییەکم لەسەفەر نەکرد ... لە پێکەنینێکما !
دڵنەواییەکی تەنهایم نەدایەوە ... لەقەرەباڵغیما !
وەڵامی پرسیارەکانی ئەومناڵانەم نەدایەوە ... لەخەونما !
شیعرێکم بۆ شەهیدان نەخوێندەوە ... لەبێزاریما !
هیچ نوتقێکـــــــــم نەدا ...
هـیـــچ ... هـ .. یــ.. چ.. !!
نەلەچونما .. و.. نەلەگەڕانەوەما !
خودایە ... من لەو هەڵەیەت نابوورم !!
ئیتر تێگەیشـــــتم ..
تێگەیشتم لەوەی ،
کەهەرکەسێك مەیلی تەنهایی بکا



مردن وەك گوڵدانێکی بێزار ،
خۆی لەبەردەمیا وردو خاش ئەکا !
تۆ ... بمبـــــــەرەوە ،
بمبـــــــەرەوەو
وەك دیارییەکی دەستت ... دابەشمــــکە !
وەکو لقێك هەتــــــاو ،
بمـــــــــدە ..
لەبەر یەخەی پە نجەرەیەکی وەجاخ کوێر !
وەکو پیاوێکی قایـــــــمکار ،
بمکـــــــــــە ..
بەقاسیدی کۆڵانێکی بەرچاو تەنگ !
تـــــــــۆ وەرەو
دورم خـــــەرەوە ،
لەو قەناعەتانەی ... کە ئاوسن بەبەرد !
لەوڕێگایانەی ... کەهەرگیز باوەڕیان بەدەریا نییە !

لەوتەیرانەی ... کەئاماژەن بۆبارینی بەفرێکی وشك ،
وشك بەتەنهایــــــی !!
نیوە شـــــــەوەو
عەیامێکە من مردووم !
بەشڵەژاوی مردووەکانا تێئەگەم ..
ئەو ئەسپانەی کەئەگەنەلای ئێمە ،
بە بـــــــاران دۆڕاون ..!
ئەو ئەستێرانەی لەسەر ئێمەن ،
لە تەریقییا هەڵدێن ..!
نازانـــــــم چۆن ،
چۆن .. بەناو باخی ئەو پیاوە ڕەزیل و چروکانەدا بگەڕێمەوە ؟
ئەو پیاوانـــــەی ..،
کە هەمیشە بەدیار دارگێلاسەکانیانەوە جگەرە ئەکێشن و
گەرەکیــــــانە ،
کە هەموو گەردوون ... بکەنە شەتڵی لیمۆ !!



تـــــــۆ وەرەو
بمبـــــەرەوە ،
ئەی ئەو برادەرە غەمگینەی ،
کەلەیەکەمین ئێوارەی دروست بوونتەوە
ئەڵــــــــێی :
ئێمە ... لەسەرەتای جەنگێکی گەورە داین !
واشەو ، خەریکە هیلاك ئەبێ و
منیش عەیامێکە مردووم !!
وەلـــــــــێ ،
هەرلەیەکەمین شەوی مردنمەوە تێگەیشتم ،
کەدەبێ ...ئیدی تەنهابم !!
دەنـــــــــا ..،
من لە نێوان ژیان و مەرگا ..
پیاوێکم لێدەرئەچێ ،
هەمیشە عاجز ... لەخودا !

**هەمیشە توڕە ... لەحەقیقەت !**

**هەمیشە بێزار ... لەعەشق !**

**لەم دەمە دەمی گەڕانەوەیەما ..**

**تازە تێدەگەم لەقسەی ئەو شەهیدەی ،**

**کەبەردەوام ئەیـــــوت :**

**برادەر ... ژیان دەستنوسی جەنگاوەرێکی دۆڕاوە !!**

**ئیـــــــدی ،**

**گەمژەییە ... سەفەرکردن بۆدوورگەکانی ئاسودەیی !**

**دۆڕاوییە ... خەوبینین بەخەیاڵاتەکانی مەعشـوقەوە !**

**خەجاڵەتییە ... باوەڕهێنان بەکۆتایی مەرگ !**

**ئیـــــــدی ،**

**هەموو دەمامکەکان و**

**هەموو جلـــەکان و**

**هەموو توڕەبونەکانم ... ئەبەخشمە ئەستێرە نزیکەکانی قەراغ دەریا !!**

**دێمـــــــەوە ..،**



**دێمەوەو .. درەنگتر لەجاران ..،**

**بەبـــــێ هیچ غەرەزێك ،**

**شەو لەتەنیشت گوڵەیاسەمینەکانەوە ئەخەوم !**

**ماچی یەکەبەیەکەی گەڵاهەڵوەریوەکانی لاولاو ئەکەم !**

**دێمـــــــەوەو**

**هەروەکو جارانی مناڵیم ،**

**وڕك لەهەموو ئەستێرەکانی ئاسمان ئەگرم !**

**دێمـــــــەوە ،**

**وەلێ زۆر درەنگتر لەجاران ،**

**دەستەکەمەوە بەنوزە نوزو ..**

**قوڵپ ئەدەمەوە لەتەنهایی !**

**ئەمشـــــــەو ،**

**کەئیدی ئەزانم من عەیامێکە مردووم ..**

**هەموو دەرگاو پەنجەرەکان لەسەر دنیا دائەخەم و**

**شڵپەم دێ لە مەرگ و ... تەنها خۆمم !**

بێهودەیم لێئەچۆڕێ و ... هەر تەنها خۆمم !
هەرتەنها خۆمم و ... هەر خۆمم !!
هەرخۆمـــــــــم و
بەداگیرسانی جگەرەکەما ئەزانم ،
کە من تاکو ئێستا ... لەمانای گریان تێنەگەیشتووم ؟
بەئاوێنەکەیا بیرم ئەکەوێتەوە ،
کەمن ... وردو خاش بووم ؟
بەچرکە چرکی سەعاتەکەیا بەئاگادێمەوە ،
کەمن هەرگیز ناتوانم ... لەت وپەتی خۆم بەیەکا بلکێنمەوە ؟
بەتاریکییا دێتەوە زاکیرەم ،
کەمن ... عەیامێکە مردووم ؟!
ئـــــای ... چۆن سادەیمم تالآن فرۆشکرد ؟
ئـــــــای ..،
چۆن ئەم وەسوەسەی خۆکوشتنە کەوتە سەرمەوە ؟
تۆ بڵـــــــێ :



بۆخۆم بەژماردنی تاڵە سپییەکانی قژمەوە خەریك نەکرد ؟
یـــــــــان ..،
بۆخۆم بەقسەکردنەوە نەخلآفان لەگەڵ کوژراوەکانا ؟
یـــــــــان ..،
بۆ قەترە قەترە خۆم خەریك نەکرد بەڕەنگکردنی ئاوەوە ؟
خودایە ... چەند مردوویەکی گەمژەم !!
نیوە شـــــــەوەو
وەلێ نازانم چۆن ،
لەدەرگای ئەو پیاوە یاخییانە بدەم ،
کەمن ... کەڵکەڵەی گەڕانەوە لەمێشکمایە ؟
نازانـــــم  چۆن ،
دڵی ئەو ئافرەتە ئیماندارانە ڕازیکەم ،
کەمن ... وەسوەسەی خۆکوشتن لەسەرمایە ؟
ئـــــای ... چ نەگبەتییەکە !!
لەنێوان ژیان و مردنـــــــــا ،

هیچ وەفایەك نەماوەتەوە ... بۆ تەنهایی !
هیچ ئومێدێك نییە ... بۆ بەردەوامی !
هیچ پەنایەك شك نابەم ... بۆ ئاسوودەیی !
من ... بوغزی ژیان فێری کردم ،
هەمیشە دەموچاوم بەم بەیەکا !!
ئیـــــــدی ...،
مردنمان بۆچییە ؟
تەنهایمان بۆچییە ؟
کەشەو هەموو حیکمەتەکانی کەون ونکا !
من ... کەهەناسەیەکم بەژیانەوە بێت و
خەیاڵیشم ڕەدوی مەرگ کەوتبێ !
من ...کەدڵم عاشق بێت و
سەریشم سەفەری کردبێ !
من ... کەدەستێکم بەدوعاوە بێت و
دەستەکەی تریشم کوفرەکانم بژمێرێ !



چۆن بیابان کەم نییە ... بۆهەڵهاتن ؟
چــــــــۆن ..؟
هەڵهاتــــــن ..،
مردنی پەپولەیە لە تەریقبیا !
خەولێکەوتنی خاڵخاڵۆکەیە لەشەرما !
خۆکوشتنی هەنگە لەدڵتەنگییا !
ئـــــای لەشەو ..
چۆن کەرت و پەرتمان ئەکا ؟
چۆن مەحکوممان ئەکا ..،
بەمــــردن
بـــە گومان
بـــە ترس !!
شـــەو هات ... تەنهایم ... شـــەو !!
وەرە ببە بەهاوڕێم بۆ دۆزینەوەی دەم و چاوم !
وەرە..،

وەرە با پێکەوە خەیاڵی ڕژاومان کۆکەینەوە !
بەچواردەوری خۆتا دەست بگێڕە بۆقاچەکانم !
تاقەتێکم بەرێ بۆتەواو بوونی ئەم سەفەرە !!
دڵێکم بۆ پەیاکە بۆتەواو بوونی ئەم مردنە !!
دڵـــــی مانگ بچوکە ..
دڵی پشیلەش پڕە لەترس ..!
شـــــەو هات ..،
تەنهایم جێم مەهێڵە ... شـــــەو هــات !!
شەو ئە مخـــــوات ..
شەو درۆم پێ ئەکات ..
شەو هەراسانم ئەکات ..
شەو پەرت پەرتم ئەکا و
هەرتەواونابێ و... هەرتەواونابێ و ... تەواونابێ و...
تەواو نابێ و ... نـــابێ و ...نـــابـــێ !!!
لەشـــــەودا ،



گوڵ پێـــــــم ئەڵێت :
تـــۆ .. عەیامێکە مردوویت !!
شەو.. ڕوتمان ئەکاتەوە لەمانـــا ،
هەروەك ئەوتاریکییەی کەلەنێوان دوو ڕوناکییا هەیە !
یـــــــان ..،
وەکو ئەو گوڵەبۆندارەی کەلەماڵی پیاوێکی ئاگر پەرستا هەیە !
شـــــــەو ... ئە تمرێنێ ،
مردن ... تا ئەو باوەڕەی کەعەیامێکە مردوویت و
هیچ ناڵێـــــــی !!
شـــەو ... بچوکتەکاتەوە ،
بچوك ... تائەو ئەندازەیەی باران ئە تخوســـێنێتەوە و
ڕازـــــــیت !!
شـــــــەو .. .. دڵت لێئەدزێ .. .. دڵت ون ئەکا ...،
وەك ئەو قوتابییەی ... کەلەئیمتیحانا دڵی لێ جێئەمێنێ !
وەك ئەو کچەی ... کەلەمومارەسەیەکی جنسییا دڵی لێئەدزرێ !

وەك ئەو پیاوەی ... کەلەسەر بەرماڵێکا دڵی لیٚ وون ئەبیٚ !
وەك ئەو شەهیدەی ... کەلەکاتی جەنگا دڵی بەدیل ئەگیریٚ !
شـــــــــەو ..،
هەرتەواونابیٚو ... هەرتەواونابیٚو ... هەرتەواو نـــابیٚ !!
لەشـــــــەودا ..،
بۆنی عەشقی سوتاو ئەکەم ،
لەکۆڵانەکەمانا !
حاشای باڵندەم گویٚ لیٚ ئەبیٚ ،
لەحەوشەکەمانا !
جویٚنی مناڵ ئەبیستم ،
لەماڵەکەمانا !
لەشـــــــەودا ..،
دایکم ... نەفرەت لەخۆیی و پشیلەو ( بـا ) ئەکا !
باوکم ... تورە ئەبیٚ لەخۆیی و پەرەسیٚلکەو باخچە !
تەنهایـــــــــی ..،



وەرە با پیٚکەوە بچینەوە سەر یەکەمین دیٚڕی باران و
نەفرەت بکەین .. لەشۆڕش !
نەفرەت بکەین .. لەشەو !
نەفرەت بکەین .. لەخودا !
نەفرەت بکەین .. لەشەهید !
نەفرەت بکەین .. لەگەورەبوون !
نەفرەت بکەین ..لەسنوور !
نازانم چۆن لەڕقی مرۆڤ تیٚبگەم ... بۆ مردن ؟
نازانم چۆن لەترسی مرۆڤ تیٚبگەم ... بۆتەنهایی ؟
شەو هەرگیز تەواو نابیٚ !!
شەو هەرگیز هیلاك نابیٚ !!
تیٚگەیشتـــــــم لەوەی ..
کەئیـــــــــدی لەشەوا ،
ناتوانم .. سەیری کیسەڵ بکەم و
بۆنی پیری نەکەم لە پشتیا !

ناتوانم .. بەدیار چراوە دانیشم و
چارەنوسی تاریكی نەخوێنمەوە !
ناتوانم .. لەگەڵ یاردا پێبكەنم و
ژنە شەرعییەكانی خودام بیر نەكەوێتەوە !
ناتوانم .. قسە لەگەڵ دایكما بكەم و
خەڵوەتەكانی باوكم بیرنەكەوێتەوە !
ناتوانم .. گوێ بۆدوعاكانی ژنەكەی دراوسێمان نەگرم و
بێهودەیی ئەوشەهیدانەم نەكەوێتەوە یا د ،
كەبەدەست كردنەوەی دەرگاكانی فیردەوسەوە پیربون !
ناتوانم .. ڕازییم لەگەڵ گولا سەما بكەم و
قەتلوعامی باخچە لەبیر خۆم بەرمەوە !
ناتوانم .. بەدیار كچێنی دەریاوە بگریم و
ئەو شەوانەم بیربچێتەوە كەگیا ،
خۆی هەوەسی خۆی دائەمركانەوە !
ئێستاكە تێگەیشـــــــتم ،



كەناتوانـــــــــــم ..،
هەرگیز سەیری ئاوێنە بكەم و
عەیامێك مردنی خۆم ... بیرنەكەوێتەوە !!

مانگی ( ٨ بۆ ١١ ) /٢٠٠٢ / سلێمانی

## *من ... چیرۆکەوانـــی دەریام !*



*« بێ دوو دڵی و*

*یەکسەر لەدەریاوە ..،*

*من ... چیرۆکەوانی دەریام ! »*

* * *

**گوێ بگـــــــرن ،**

**ئەمجارەیان لەدەریاوە هاتوومەوە !**

**لەدەریـــــــاوە ...**

**ماڵێکم پێیـــــە ،**

**سەرڕێژە لە غروری کچان !**

**لەدەریـــــــاوە ...**

**هەردوو گیرفانم پڕکردووە ،**

**لەبۆنی عەتری گیا و**

**لەتامی جەنگی خوساوە !**

**گیرفانـــــــــم پڕە ،**

لەعەشقی بچوك بچوکی شـێدار و
لەوردە ماچی سەرما بردەڵە ...!
من ... کەلەدەریاوە دێمەوە
جەستەم شەلاڵە لەئاو و
ڕۆحیشـــم لەتەنهایی ...!!
من ... کەبیرکردنەوەم ،
لەکۆڵانە تەنگەبەرەکانی ئاوا لێجێما
ئەبێ باخچە بمبەخشێ ،
کەنامپەرژێـتە سەر ماچکردنی ،
یەکەبەیەکەی گوڵەکانی !
ئەبێ دایکم بمبەخشێ ،
کەناتوانم عەسرێك لەلای بمێنمەوە ...،
بۆخوێندنەوەی شـیعرێك و
بۆخواردنی قاشـێك کێك و
بۆژماردنی دەنکە بەدەنکەی تەزبیحەکانی !



ئەبێ مامۆستا بمبەخشێ ،
لەنەچوونەوەم بۆ قوتا بخانە !
لەئیکمال بوونم لەوانەکانی زاکیرەدا !
ئەبێ مامۆستا بمبەخشێ ،
لەنەزانین و بێدەنگیم ،
لەوتنەوەی ئایەتەکانی خۆکوشتنا !
لەنەهاتنە ژورەوەم ،
بۆدەرسەکانی سیاسەت !
ئەبێ مامۆستا بمبەخشێ ،
لەخەیاڵ ڕۆیشتنم لە پۆلا ،
بۆلای یـــــــار و
لەنەکردنی سلاوێك ،
لەژوری ئیـــــــدارە !!
من ... کەلەدەریاوە دێمەوە ،
گوناهبارێکی ئەبەدیم ... لەفڕینـــا !

دەستەواژەیەکی چەوتم ... لەڕاموسانــــا !

مناڵێکی ڕاکردوم ... لەحەقیقەتـــا !

من ... کەلەدەریاوە دێمەوە ،

بەرپرســـــیارم !؟

بەرپرســـــیارم ،

لە پەرشوبڵاویی ئەو ژورەی ،

کەباوکم خۆی تیاکوشــت !

بەرپرســـــیارم ،

لەبانگکردنی چـــایەکی کەم شەکر ،

کەهاوڕێکەم بانگی کردو نە یخواردەوە !

بەرپرســـــیارم ،

لەتەکاندنی ئەوتە پوتۆزەی ،

کەبەسەر شـــوشە عەترەکانی دایکمەوەیە !

من ... بەرپرســـیارم ،

لەفڕینی چۆلەکەیەك ،



کەتەنهایی خواردوویەتی !

بەرپرســـــیارم ،

لەخەتی ناخۆشی مناڵێك ...،

کەلەدەفتەری وێنەکەیا نووســـیویەتی ،

ئای چەند ناخۆشە ... ژیان و مەکتەب و باران !

بەرپرســـــیارم ،

لەگرژومۆنی باخەوانێك ،

کەهەموو هەنارەکانی لەتەنهاییا شەقیان بردووە !

بەرپرســـــیارم ،

لەڕەنگکردنی ئەو جەنگەی ،

کەجەنەڕاڵێکی پیر بێــهوودە ئەکا !

من ... بەرپرسیارم ،

لەو نیگارکێشـــەی ،

کەنازانێ فڕین ڕەسمکا !

بەرپرســـــیارم ،

لەشـــارێك مێرووله ،
کەدڵیان بەباخچە ناکرێتەوە !
بەرپرســـــیارم ،
لەکۆکردنەوەی هەموو ئەو نیشـــتمانانەی ،
کەلەکتێبی جوگرافیادا هەیە !
بەرپرســـــیارم ،
لەشەرحکردنی گۆرانییەك ،
کەباران تێی ناگا !
من ... لەدەریاوە هاتومەوە !!
لەدەریادا کەس ناژی ،
تەنها یادەوەری نەبێ !
گەڕەکەکانی دەریا ،
پڕن لەماڵی چۆڵ و
پڕن لەگلەیـــــی !
پارکەکانـــی دەریا ،



جمەیان دێ لەکوفر و
سەررێــژن لە پەشیمانی !
لـــــــەوێ ،
تەنها یەك چەشنە گۆرانیت گوێ لێئەبێ و
لـــــــەوێ ،
هەموو شـــتێك تەڕە ... تەڕ !!
لـــــــەوێ ،
ئێوارە تەڕە و
جادە تەڕە و
ئینجانە تەڕ !
لـــــــەوێ ،
مردن تەڕە و
کۆڵان تەڕە و
عەشق تەڕ !
لـــــــەوێ ،

منالێــــــم تەڕە و
ڕاکردنـــــم تەڕە و
هەمیشە ... سەفەرم تەڕ !
لــــــەوێ ،
هەموو شــتێك تەڕە ... تەڕ !!
ئە مجارەیـــــــان ...،
لەدەریاوە واهاتوومەوە ،
کەهەرگیز نەگەڕێمەوە !
واهاتـــــوومەوە ،
کەڕەسمێك لەگەڵ خەیاڵی تەڕی کۆترا بگرم !
واهاتــــوومەوە ،
کەئەمشەو لە باخێك پرتەقالاّ بەرمە سەر !
واهاتــــوومەوە ،
کەتا ( با ) حەزکا ڕاکەم !
واهاتــــوومەوە ،



کەتەنهایم پڕکەم لەتریفە و
نامەیەکی تر بدەمەوە بەشکســتم و
سەر بەماڵی گەیوی خەیاڵما بکەم !
ئە مجارەیـــــان ...،
واهاتـــــــوومەوە ،
کەبەدەم شــیعرێکەوە ...،
بۆ دەریــــا و
بۆ یـــادەوەری و
بۆ ژیـــان ... بـــگریـــم !!

( مانگی ٩ / ٢٠٠٣ – کۆتایی ساڵی / ٢٠٠٣ )
سلێمانی

